پاولۆ کۆیلۆ

# مەکتوب

رۆمان

وەرگێڕانی لە فارسییەوە
یاسین عومەر

سلێمانی ٢٠٠٢

- ناوی كتێب: مەكتوب
- ناوی نووسەر: پاولۆ كۆیلۆ
- ناوی وەرگێڕ: یاسین عومەر
- بابەت: ڕۆمان
- تیراژ: ٤٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن : (١٧٧) ی ٢٠٠٢
- كۆمپیوتەرو ئۆفسێتی دەزگای سەردەم

زنجیرە كتێبی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم (١٧٠)

## مەکتوب

(مەکتوب) بە واتەی "ئەو شتەی نوسراوە". بەڵام عەرەبەکان وا هەست دەکەن کە ئەمە وەرگێڕانێکی گونجاو نەبێ بۆ ئەم وشەیە، لەبەر ئەوەی هەرچەندە هەموو شتێك لە پێشەوە نوسراوە، بەڵام خواوەند میهرەبانە و تەنیا بۆ یارمەتی‌دانی ئێمە ئەو شتانەی نوسیوە.

نوسەر لە نیویۆرکە، بەمەبەستی ئامادە بوون لە مەوعیدی چاو پێکەوتنێك هەندێك درەنگ کەوتووە. کاتێ لە ئوتێل دێتە دەرێ، سەیر دەکات پۆلیس ئوتومبێلەکەیان بۆ گەراژی وەستانی ئوتومبێلان گواستۆتەوە. خواردنی نانی نیوەڕۆ زیاد لە پێویست دەخایەنێ و سەر ئەنجام درەنگ دەگاتە سەروەختی مەوعیدەکە. بیر لەو زیانە دەکاتەوە کەدەبێت بەهۆی ئەم درەنگ کەوتنەیەوە بیدات. درەنگ کەوتنەکەی بەگران لەسەری تەواو دەبێت.

لەپڕ بیری دەکەوێتەوە کەڕۆژی پێشوو دراوێکی دۆزیوەتەوەو هەڵیگرتۆتەوە. هەست دەکات جۆرە پەیوەندییەکی هێمائامێز لەنێوان دراوەکەو ڕوداوەکەی ئەو ڕۆژەدا هەیە.

بیر دەکاتەوە: " کێ چوزانێت. ڕەنگە وابڕیار بووبێ کەسێکی تایـەت پارەکـە بدۆزێتەوە، بەڵام لەپێش ئەوەی ئەو کەسە تایبەتە ئـەو هەلـەی بـۆ هەڵبکـەوێت مـن پارەکەم دۆزیوەتەوە! ڕەنگە من ئەم پارەیەم لەسە ڕێی کەسێ دوور خستبێتەوە کـە بەڕاستی پێویستی بەو پارەیـە هـەبووە. کـێ چوزانێـت؟ ڕەنگـە ئـەو ڕوداوەی مـن بەشداریم تیادا کرد لەپێشەوە نوسرابێت."

نوسەر هەست دەکات کەدەبێت خۆی لەشەڕی ئەو دراوە قوتـار بکـات. هەرلـەو ساتەوەختەدا لەقەراخی شۆستەکەدا مرۆیـەکی شـڕۆڵە دەبینـێ. یەکسـەر دراوەکـە دەدات بەسواڵکەرە شڕۆڵەکەو هەست دەکات بەجۆرێ لەجۆرەکان هاوسـەنگی بـۆ شتەکان گێڕاوەتەوە.

شڕۆڵە دەڵێت: " ڕاوەستە. من دەرۆزەکەر نیم. من شـاعیرم و دەمـەوێ لـەبری ئەمە شیعرتان بۆ بخوێنمەوە."

نوسەر دەڵێت: " زۆر باشە، بەڵام باشتر وایە زۆر درێژ نەبێت، چوون پەلەمە."

شـڕۆڵە دەڵێـت: " ئەگـەر هێشـتا زیندویت، ئـەوا لەبـەر ئەوەیـە کـە هێشـتا نەگەیشتوویتەتە ئەو شوێنەی کەدەبێت لێبیت."

١

بیر لەمارمێلکە بکەرەوە.

هەموو تەمەنی لەسەر زەوی بەسەر دەبات، ئاوات بەباڵندەکان دەخوازێو لەوەی چارەنوس بۆی دیاری کردوە ڕەنجاوو زیزە.

بیر دەکاتەوە: " من ناحەزترین مەخلوقی جیهانم، ناشرین، موچوڕکهێنەرو مەحکوم بەخزین لەسەر زەوی."

ڕۆژێك دایکە سروشت داوا لەمارمێلکە دەکات کەقۆزاخەیەك بچنێت. مارمێلکە دەتۆقێ. ئەو تائەو ڕۆژە هیچ قۆزاخەیەکی نەچنیوە. پێیوایە بەم کارە گۆڕی خۆی دروست دەکات و خۆی بۆ مردن ئامادە دەکات.

سەرباری هەموو ناڕەزایەتیەکانی لەژیان، گلەیی لەخواوەند دەکات:

"خودایە، ئێستا کە لەگەڵ ئەم ژیانەدا ڕاهاتووم، دەتەوێت هەموو ئەو شتە کەمانەی کەهەمن لێم بسەنیتەوە."

بە نائومێدییەوە خۆی لەقۆزاخەکەدا حەپس دەکات و چاوەڕوانی سەر ئەنجامی کارەکە دەکات.

پاشی چەند ڕۆژێ بۆی دەردەکەوێت کە بۆتە پەپولەیەکی جوان. دەتوانێت بەئاسمان دا بفڕێتو هەمووان ئافەرینی دەکەن.

مارمیلکە لەواتای ژیانو ئیشو کاری خواوەند سەری دەسورمی.

## ٢

کابرایەکی غەریبە  چووە لای سەر گەورەی پەرستگەی سیتاو داوای ڕێنوێنی لێکرد: " دەمەوێت باشتر بژیم، بەڵام ناتوانم مێشکم لەبیرگەلی ئالودە بە گوناه پاك بکەمەوە."

باوکی گیانی "قەشە" سەیرێکی دەرەوەی کرد. بایەکی خۆش دەهات، ڕوی کردە کابراو گوتی: "گەرمای ئێرە ئازاردەرە. دەتوانیت هەندێ لەو بایە بگریتو بیهێنیتە ژورەوە تائێرە فێنك تر بێت؟"

کابرای غەریبە گوتی: " ئەم کارە ئەستەمە."

باوکی گیانی گوتی: " ئەوەی تۆش دەتەوێ  بەهەمان ئەندازە ئەستەمە. بەڵام گەر بزانیت کەچۆن  وەسوەسەکان لەخۆت دوور بخەیتەوە، ئەوا هەرگیز قۆرتێ نابینی."

٣

پیر دەڵێت:

" ئەگەر بڕیارە بڕیارێ بدەیت، باشتر وایە ئەم کارە ئەنجام بدەیت و لەگەڵ ئاکامەکانیدا دەستو پەنجە نەرم بکەیت. تۆ پێش وەخت نازانیت ئەو ئاکامانە چین. هونەری غەیببێژی هاتە ئاراوە تائەو پەندە فێری خەڵکی بکات کەهیچ کاتێ خەیاڵی پێشبینی کردن بەئایندەوەی بەمێشکدا نەیەت. هونەری غەیببێژی پەندێکی باشە بۆ خەڵکی، بەڵام لەپراکتیکدا دەستەوەسانە لەئەنجامدانی ئەو شتەی ئیدعای دەکات.

(عیسا لەیەکێ لەنزاکاندا بەئێمە دەڵێت: " باویستی خواوەند بەدی بێت." کاتێك کەدەیەوێت کێشەیەك حەل بکات، ڕێگا چارەیەکیش دەخاتە بەردەست. گەر بڕیار بوو هونەری غەیببێژی بتوانێت ئەوشتەی کەدەیلێ بەکردەوە جێبەجێی بکات، ئەوا دەبوو هەموو فاڵگرەوەو تاڵعبینەکان سامانداروبەڕێزو بەدەسەڵات بوونایە.)

٤

موریدێ هاتەلای پیرەکەی و گوتی: "سالگارێکە بەدوای ڕونـاکیدا دەگـەڕێم، وای بۆ دەچم نزیکم پێی بگەم. دەمەوێت بزانم هەنگاوی دوای ئەوە چییە؟"

پیر گوتی:" چۆن چۆنی ژیانت دەگوزەرێنی؟"

مورید گوتی:"هێشتا فێری ئیشێك نەبووم. باوك و دایکم یارمەتیم دەدەن. پێم وایە ئەمە مەسەلەیەکی زۆر گرنـگ نەبێت."

پیر گوتی: هەنگاوی دوای ئەمە ئەوەیە کەنیو خولەك چاوببڕیتە خۆر."

مورید بەقسەی کرد. پاشی نیو خولەك، پیر داوای لەقوتابییەکـەی کـرد وەسـفی دیمەنی چوار دەوری بکات.

قوتابی گوتی:" هیچ شتێ نابینم. خۆر کاری لەبیناییم کردوە."

مـوراد (پـیر) گوتـی: ئـەو کەسـەی کـە بەتەنـها بـەدوای ڕوناکییەوەیـەو خـۆی لەئەرکەکانی دەدزێتەوە، هەرگیز ڕوناکی بەدەسـت ناهێنـێ. ئـەو کەسـەی بـەردەوام تەماشای خۆر دەکات کوێری چاوەڕوانی دەکات.

٥

پیاوێك لەیەكێ لەدۆڵەكانی كوێستانی " پیرنە "، لەحاڵێكدا كەبەرێدا دەڕۆیشت بەشوانێكی پیر گەیشت و خواردنەكەی لەگەڵدا بەش كرد. پاشان ماوەیەكی دوورو درێژ لەگەڵ یەك دانیشتن‌و لەبارەی ژیانەوە قسەیان كرد.

پیاوە گوتی: "ئەگەر كەسێك بەڕاستی باوەڕی بەخودا هەبێت، دەبێت قبوڵی بێت كەمرۆڤێكی ئازاد نییە، لەبەر ئەوەی خواوەند فەرمانڕەوایە بەسەر هەموو جوڵەیەكدا."

شوانە كابرای بۆ دۆڵێكی قوڵی ئەو دەوروبەرە برد، بۆ جێگەیەك كەمرۆڤ دەیتوانی بەڕوونی دەنگ دانەوەی دەنگی خۆی ببیستێ.

شوانە گوتی:"ژیان وەكو ئەم دیوارانەیەو چارەنوس وەكو هاوارێكە كەهەر یەك لەئێمە دەشێت بیكات. هاوارەكەی ئێمە بەر دیوارەكە دەكەوێت‌و بەهەمان شێوە سەرلەنوێ بەرەو لامان دەگەڕێتەوە. خواوەند وەكو دەنگدانەوەی دەنگی ئێمە وایە."

٦

پیر دەڵێت:

" سەردەمێ دیت هەست دەکەین کاتی ئەوە هاتووەکە گۆرانکارییەك ساز بکەین. لەم کاتەدا- لاشعورییانە- کاسیتەکە لەسەرەتاوە لیدەدەین تاسەر لەنوێ تەماشای تیکشاندنەکانمان بکەین.

" هەرچی زیاتر لەژیاندا بەرەو پیش دەرۆین، زیاتر ساتەوەختی دژوار لەژیانماندا دیتە پیشەوە. هاوکات ئەزمون، بۆ سەرکەوتن بەسەر گرفتەکان و بەدەست هینانی ریگەی پیشرەوی ئامرازگەلیکی بەهیزتر دەخاتە ئیختیارمانەوە. کاسیتی دووهەمیش هەیە کەدەبیت ئەویش لیبدەین.

" ئەگەر تەنیا تەماشای کاسیتی شکستەکانمان بکەین، نائومیدی لەپەلوپۆمان دەخات، خۆگەر تەنیا تەماشای کاسیتی سەرکەوتنەکانمان بکەین، دووچاری لەخۆبایی بوون دەبین و خۆمان لەوە بەزاناتر دەزانین کەهەین.

" ئیمە پیویستمان بەهەردوو کاسیتەکەیە."

٧

موريد بەپیرەکەی گوت: " من زۆرتر ڕۆژگارم بەبیرکردنەوە لەشتگەلێ کە نابێت بیریان لێ بکەمەوە و بەڕۆچوون بەئارەزوو گەلێکدا کەنابێت بە مێشکمدا بێن ، هەروەها بەدالغەی بێهودەوە، بەسەربردووە."

پیر قوتابیەکەی بۆ پیادە ڕێیەکی دارستانی پشتەوەی ماڵەکەی بانگهێشت کرد. لەڕێگە، پیر گیایەکی پیشانی موريد داو پرسی ئەمە چ گیایەکە؟"

موريد وەڵامی دایەوە: "بلادۆنا، گیایەکی ژەهراویە کەهەر کەس تامی بکات دەتوانێت بیکوژێت."

پیر گوتی: "بەڵام ناتوانێت کەسێ بکوژێ کەتەنیا تەماشای دەکات. داواو تکا سەلبیەکانیش، ئەگەر لەڕێت لانەدەن، ئەوا ناتوانن ئازارێکت پێبگەیەنن."

## ٨

لە نێوان فەرەنساو ئیسپانیادا زنجیرە شاخێ هەیە کە لەگۆشەیەکی پشتی گردۆڵکەیەکیدا ، گوندێك بەناوی ئارجلس[1] هەیە.

هەموو رۆژێ پاش نیوەڕۆ، پیرەمێردێ بەسەر ئەم گردۆڵکەیەدا سەر دەکەوێتە سەرێ. نوسەر کاتێ بۆیەکەمین جار پێی نایە ئەم گوندەوە، ئاگایەکی لەم مەسەلەیە نەبوو. لەگەشتی دووەمدا سەیری کرد دووبارە هەمان پیرەمێردی بینییەوە و هەرجارێ کەبۆ ئەو گوندە دەڕۆشت پیرەمێردی دەبینیو بەوردییەکی زیاترەوە لەوردە کارییەکانی ورد دەبووەوە: جلەکانی، کڵاوە چەرمییەکەی، گۆچانو چاویلکەکەی.

ئەم رۆژانە هەرکاتێ نوسەر بیر لەو گوندە دەکاتەوە، ناخود ئاگایانە پیرەمێردیشی بیردەکەوێتەوە. نوسەر تەنیا یەك جار لەگەڵ پیرەمێرد قسەی کرد. بەگاڵتەوە لێی پرسی: " پێت وایە خوا لەم کوێستانە جوانەدا دەژی؟"

پیرەمێرد وەڵامی دایەوە: " خوا لەهەر شوێنی رێگەی چوونە ژورەوەی پێ بدەن، دەژێت."

---

[1]. Argeles

٩

شەوێك ، پیرێك لەگەڵ موریدەكانیدا خەڵوەتی هەبوو. پیر داوای لەموریدەكان كرد ئاگرێك بكەنەوە تابتوانن لەدەوری دابنیشن‌و برێك قسە بكەن.

پیر گوتی: " رێگای مەعنەوی وەكو ئەم ئاگرە وایە كەلەبەر دەممانـدا دەسوتێ. كەسێ كەدەیەوێت ئاگرێ بكاتەوە سەرەتا دەبێت بەرگەی دوكەڵێكی ناخۆش بگرێت كەهەناسەی دژوار دەكات‌و چاوانی پڕ لەفرمێسك دەكات. ئابەم شێوەیەیە كەباوەڕی سەرلەنوێ دەبوژێتەوە. بەڵام كاتێ ئاگرەكە داگیرسا، دوكەڵ نامێنێ و گڕوگەرماو روناكییەكی خۆش دروست دەكات."

یەكێ لەموریدەكان پرسی: "چۆنە ئەگەر كەسێكی تر ئاگرەكەمان بۆ داگیرسێنێ؟ یان یارمەتیمان بدات خۆمان لە دوكەڵەكە بەدوور بگرین؟"

موراد گوتی: " ئەو كەسەی وادەكات، پیرێكی ڕاستەقینە نییە. رێبەری ڕاستەقینە دەبێت بتوانێت ئاگرەكە بۆ هەر كوێیەك كە دەیەوێت ببات یان هەر كاتێ كەویستی بیكوژێنێتەوە، چونكە ئەو لەبەر ئەوەی هیچ كەسێكی فێری ئاگر كردنەوە نەكردوە، دەشێت هەمووان لەتاریكیدا بەرەڵا بكات."

## ١٥

پیرێك بەقوتابییەكـەی گـوت: "لـەم ڕێگەیـەوە كـەدەڕۆی، بەدەرگایـەك دەگـەیت ڕستەیەكی لەسەر نوسراوە. بگەڕێرەوەو پێم بڵێ ئەو ڕستەیە چی دەڵێت."

موريد، لەش و ڕۆحی خستنە گەڕانو سەر ئەنجام ڕۆژێ گەیشتە ئـەو دەرگایـە. ئەوجا هاتەلای پیرەكەی و گوتی: ڕستەی سەر دەرگاكە ئەمە بوو: ناشێ.

پیر پرسی: " ئەو ڕستەیە لەسەر دەرگاكە بوو یان لەسەر دیوارەكە؟"

موريد وەڵامی دایەوە: " لەسەر دەرگاكە."

پیر گوتی: " زۆر باشە . كێلونەكەی بسووڕێنەو دەرگاكە بكەرەوە."

موريـد بەقســەی كـرد. كاتــێ دەرگاكـە بەتــەواوی كرایــەوە. ئیــتر نوســینەكە نەدەبینرا.

موريد درێژەی بەڕێگاكەیدا.

## ١١

پیر دەڵێت:

" چاوانت لێك بنێ. یان تەنانەت بەچاوانی كراوەیشەوە، لەخەیاڵی خۆتدا پۆلـە باڵندەیەك لەحاڵی هەڵفڕیندا بێنە بەرچاوت، ئێستا پێم بڵێ چەند باڵندە دەبینی؟ پێنـج؟ یازدە؟ شازدە؟

" وەڵامەكە هەر چی‌یەك بێت - هەڵبەتە ئەمـە پرسـیارێكی دژوارە - خاڵـێ لـەم ئەزمونە بچكۆلەیەدا بەڕوونی دەردەكەوێت. دەتوانیت لەخەیاڵتدا پۆلـە باڵندەیـەك ببینی، بـەڵام ژمـارەی ئـەم باڵندانـە بـەدەرە لـە ئیختـاری تـۆ، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەم دیمەنە هێشتاش ڕوون و دەقیقە. دەبێت وەڵامێك بۆ ئەم پرسیارە هـەبێت: ئـەوەی كەژمارەی باڵندەكانی ئەم دیمەنە دیاریدەكات كێیە؟ بێگومان خۆت نیت!"

## ١٣

پیاوێك بڕیاریدا بچێت بۆ بینینی ڕاهیبێك کەلەنزیك پەرستگەی سیتا دەژیا. لەپاش ماوەیەك سەرگەردانی لەبیاباندا، سەرئەنجام کابرا کابرای ڕەبەنی (ڕاهب) دۆزییەوە و لێی پرسی: " دەمەوێت بزانم یەکەمین هەنگاوێ کەلە ڕێگەی مەعنەویدا هەڵبنرێت چییە؟"

پارسا ئەوی بۆ قەراغی کانییەکی بچکۆلە بردو داوای لێ کرد تەماشای وێنەی خۆی لەئاوەکەدا بکات. هەتا کابرا ویستی وێنەی خۆی لەئاوەکە ببینێ، پارسا چەند دانە بەردێکی هەڵدایە ناو ئاوەکەوە.

کابرا گوتی: " ئەگەر لەسەر ئەم کارەت بەردەوام بیت، ناتوانم وێنەی خۆم لەئاوەکەدا ببینم."

پارسا گوتی: " هەر بەو جۆرەی کەناتوانی لەئاوی شڵەقاودا وێنەی خۆت ببینی، هەرگیز ناتوانیت بەدوای خوادا بڕۆیت و بگەڕێیت لەحاڵێکدا کە لەم گەڕانە دڵپەشێواو بیت. ئەمە یەکەمین هەنگاوە."

لەکاتێکدا کەنوسەر، مەشقی  لەسەر چاودێری زەن[١] دەکرد، ڕۆژێ مامۆستاکەی چوو بۆ گۆشەی دوو جۆگە (شوێنی فێرکردنی قوتابیان ) و بەشوڵکە خەیزەرانێکەوە گەڕایەوە، ئەو قوتابیانەی کەنەیاندەتوانی بەباشی تەرکیز بکەن، ترسانو دەستەکانیان بۆسەرەوە بەرزکردەوە. مامۆستا لەوانە نزیك بووەوەو بەشوڵکەکە سێ دانەی کێشا بەلاشانی هەر یەکێکیاندا.

نوسەر کە بۆ یەکەمین جار ئەم دیمەنەی دی، ئەم کارەی بێهودە و چاخناوەڕاستیانە هاتە بەرچاو. بەڵام دواتر تێگەیشت کەزۆربەی جار پێویستە ئازارە گیانیەکان بگۆڕێن بۆ ئازاری جەستەیی، تابتوانرێت پەی بەزیانەکانی ببردرێت.

لەڕێگەی سان ژاکدا ڕاهێنانێ فێربوو کە  دەبوو نینۆکی پەنجەی دۆشاو مژەی لەگۆشتی قامکە گەورەیدا بچەقێنێ. ئەو دەبوو ئەم کارەی ئەو کاتە ئەنجام بدایە کە بیرگەلێکی ناڕەحەتکەری لەمێشکدا هەبوو.

ئاقیبەتی ترسناکی ئەندێشە سەلبیەکان زۆر درەنگ ئاشکرا دەبن. بەڵام ئەگەر کارێك بکەین کەئەم بیرانە، خۆیان بەشێوەی ئازاری جەستەیی پیشان بدەن، دەتوانین پەی بەو شۆکە ببەین  کەلەوانەوە سەرچاوە دەگرێ. ئەو کات دەتوانین ئەو بیرانە لەخۆمان دوور بخەینەوە.

---

١. Meditation

## ١٤

پیاوێکی ٣٢ ساڵە چـوو بـۆلای پزیشـکێ بـەناوی ریچـارد کـراولی[1] و سـکاڵای کـرد: "ناتوانم واز لە مژینی کەڵەموسەم بهێنم."

کـراولی گوتـی: " زۆر لەبارەیـەوە نیگـەران مەبـە. تـەنیا هـەوڵ بـدە هـەر ڕۆژە پەنجەیەك بمژی کەڕۆژی پێشتر نەتمژیووە."

کابرا هەوڵیدا بەوجۆرەی پێی گوترابوو وابکات. بـەڵام هـەر جـارێ کەپەنجـەی بۆدەمی دەبرد، دەبووایە هوشـیارانە بڕیـاری بدایـە کەئـەمڕۆ چ پەنجەیـەك دەبێـت ببێتـــە ئامـــانجی خووەکـــەی. لـــەپێش ئـــەوەی هەفتـــە بـــەکۆتایی بگـــات، خووەکەی نەمابوو.

ریچارد کراولی دەڵێت: " کاتێك کارێکی ناپەسـەند دەبێتـە خـوو، سـازان لەگـەڵیا دژوار دەبێت، بەڵام کاتێ بمانەوێت بەم خووە ڕەفتارگـەلێکی تـازە زیـاد بکـەین، تـێ دەگەین کەنرخی ئەو ئەزیەتەی نی‌یە."

---
[1]. Richard crowley

## ١٥

لەرۆمی کۆنـدا، ژمارەیـەك غـەیببێژ بـەناوی (سـیبیل)[١]ەکانــەوە کۆبوونــەوە و ئـایندەی ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمیـان لـەنۆ کتێبـدا نوسـی. پاشـان کتێبــەکانیان خســتە بەردەم تیبریوس. ئیمپراتۆر پرسی: "نـرخیان چەندەیە؟"

سیبیلەکان گوتیان: "سەد پارچە دراوی زێڕ."

تیبریوس بەتوڕەییەوە ئەوانی لەخۆی دوورخستەوە و دەریکردن.

سیبیلەکان سێ‌جلّد لەکتێبەکانیان سوتاندو گەڕانەوەو گوتیـان: "نـرخەکـە هـەر هەمان سەد دراوە زێڕەکەیە."

تیبریوس پێکەنی‌و گوتی: " بۆ دەبێ قیمەت بدەینە شتێك کە چ نۆ دانەبێ و چ شەش دانەبێ یەك نرخی هەبێت؟"

سیبیلەکان سێ جلّدی تریشیان سوتاندو بەوسێ  کتێبـەی مـابووەوە گەڕانـەوە و گوتیان: " ئێستاش نرخەکەی هەر سەد دراوە زێڕەکەیە."

تیـبریوس بەلێوردبوونـەوەوە تەسـلیم بـوو و بڕیـاریدا کەسـەد دراوەکــە بــدات. بەڵام ئەو ئێستا دەتوانێت تەنیا بەشێکی ئایندەی ئیمپراتۆریەتەکەی بخوێنێتەوە.

پـیر دەڵێـت: " بەشـی گرنگـی وانــەی ژیـان ئەمەیــە کەلەگــەڵ بارودۆخــەکاندا چەنەبازی نەکەین."

---

[١]. Sybil

لەئەلەمانیای نـازیدا، دوو حاخـام بـۆ دابـین کردنـی خۆشـگوزەرانی ئـاینیی جولەکەکان تـا ئەوپـەری توانـا هـەولیان دەدا. توانیـان دوو سالی تـەواو لەترسـیکی لـەوزە بـەدەردا خۆیـان لـەئازاردەرەکانیان بپـاریزن و ریورەسمـی ئـاینیی خۆیـان لـەکۆڕو ئەنجومەنـە جـۆراو جۆرەکـاندا جێبـەجێ بکـەن، بـەلام سـەرئەنجام گـیران. یـەکیکیان، هەراسـانو ترسـاو لـە روداوەکـانی داهـاتوو، بـەردەوام سـەرقالی نـزاو پارانەوە بوو، ئەویتریشیان بەدریژایی رۆژ دەخەوت.

حاخامە نیگەرانەکە لەوی تریانی پرسی: "ئەمە چ کاریکە دەیکەیت؟"

ئەوی تریان گوتی : " دەمەویت هیزی خـۆم پاشـەکەوت بکـەم. دەزانم کـەدوایی پیویستم پیی دەبیت."

حاخامـە ترسـاوەکە گوتـی: " چمـا ناترسـی؟ نـازانین چ بەلایـەکمان بەسـەردا دیت!"

ئەوی تریان گوتی : " تا ئەو کاتەی دەستگیر نەکرابووم، دەترسـام. بـەلام ئیسـتا کەکەوتومەتە زیندان، ترس لەوشتەی کە دەشیت روبدات چ سوودیکی هەیـە؟ کـاتی ترس رابردووە. ئیستا نۆبەی ئومیدە."

١٧

پیر دەڵیت :

" ویست (ئیرادە)، ئەمە هەمان ئـەو شـتەیە کەسـالانیك خـەلکی لیـی بـەدگومان بوون.

" ئەو کارانەی بەهۆی لاوازی ئیرادەوە تیایاندا شکست دەخۆین چـەندەن و ئـەو کارانەیش کەبەهۆی مەترسیداربوونیانەوە تیایاندا شکست دەخۆین چەندەن؟"

" یـەکێ لـەو کارانــەی کەبــەهۆی لاوازی ویســتەوە تیــایدا دووچــاری خــراپ لیکدانـەوە دەبـین، قسـەکردنە لەگـەڵ غـەریب و بیگانـەکان. پەیوەندییــەکی ســادە، گفتوگۆیـەك و پاشـان جیابوونــەوە. ئیمــە بەدەگمــەن لەگــەڵ بیگانــەکاندا قســە دەکەین.

" هەمیشە دەڵیین واباشترە.

" سەرئەنجامیش نەبۆ ژیان سـوودبەخش دەبـینو نـەدەتوانین لەیارمەتیـەکانی ژیان بەهرەمەند بین.

" هیشتنەوەی مــەودا دەبیتـە هـۆی ئـەوەی کـەگرنگو بەمتمانـە بەخۆبوونـەوە جیلوە بکەین. بەڵام لەراستیدا بەم کارە ریگە بەقسەی فریشتەکەمان نـادەین خـۆی لەنیو قسەی کەسانی دیدا ئاشکرا بکات."

## ١٨

پارسایەکی پیر ریی کەوتە بارەگای بەدەسەلاتترین سولتان.

سولتان گوتی: " من ئیرەیی بە لەخواترسیك دەبەم کەئاوا بەکەم قانع و رازی بیت."

پارسا گوتی: " منیش ئیرەیی بەپایەبەرزو شکۆمەندیٚ دەبەم کە بەکەمتر لەوەی من هەمە رازیە."

سولتان بەتورەیەوە گوتی: " مەبەستت چییە؟ سەتاسەری ئەم مەملەکەتە هی منە."

پیر گوتی: " وایە، بەلام من مۆزیکی فەلەکەکان دەزانم، من خاوەنی هەموو روبارو کیوەکانی دنیام. مانگو خۆر هی منن، چونکە من خودا لەرۆحمدایە. بەلام جەنابی پایە بەرز تەنیا ئەم قەلەمرەو و سەلتەنەتەی هەیە.

١٩

شاسواریك بەهاوریكەی گوت: "وەرە بچین بۆ ئەو كیوەی خوای لی دەژی. دەمەویت بیسەلمینم كەئەو تەنها ئەوە دەزانیت فەرمانمان پێ بكات، و بۆدەرباز بوونمان لەژیر باری چەرمەسەری هیچ كاری ناكات.

ئەوی تر گوتی: "رازیم. بەلام من بەمەبەستی سەلماندنی باوەرم دیم."

كاتێ گەیشتنە لوتكە، شەو داهاتبوو. لەتاریكیدا گوییان لەدەنگێ بوو:

"بەردەكانی چوار دەورتان لەئەسپەكانتان باربكەنو بیانبەنە خوارەوە."

شاسواری یەكەم گوتی: "دەبینی؟ لەپاش هەلگەرانیكی ئاوا، داوامان لی دەكات كەباریكی قورس تر هەلبگرین. مەحالە بەقسەی بكەم."

ئەوی تر فەرمانەكەی جێبەجێ كرد. كاتێ گەیشتە دامینی كیوەكە، كاتی هەلاتنی خۆر بووو تیشكی خۆر ئەو بەردانەی رۆشن كردەوە كەشاسوارە باوەردارەكە لەگەل خۆیدا هینا بوونی. ئەو بەردانە پاكو پوختترین جۆری ئەلماس بوون.

پیر دەلێ: "بریارەكانی خودا هیمائامیزن، بەلام هەمیشە بەقازانجمانن."

## ٣٠

پیر دەلیت:

" رۆلەی ئازیزم، دەبیت شتیکت پیٚ بلیم کـە دەشـیت نـەیزانی. بـیرم کردۆتـەوە کەچۆن چۆنی ئەم هەواڵە والی بکەم کەزیاتر  قـابیلی تەحـەمول بیـت، چـۆن چۆنـی لەشـریتیکی رەنگـاو رەنگـەوە بیپیچـم و بـەلینی بەهەشـت و چاوپیکـەوتنی ئەبستراکتەکان و شی کردنەوەی شتە تەماویەکانی  پـی زیادبکـەین، بـەلاّم کـەلکیکی نییە.

" هەناسەیەکی قولْ هەلکیشەو خۆت ئامادە بکە. ناچارم بیٚ پەردە و  بەئاشـکرا قسە بکەم. دلنیات دەکەم کەمتمانەی تەواوم بەراستی ئەو  شـتانە هەیـە کـەدەیلیم. هەلەو گومان و دوو دلی لەم پیشویژییانەدا نییە.

"ئەویش ئەمەیە: تۆ دەمریت.

" سـبەینیٚ یـان پـەنجا سـالی دواتـر، بـەلاّم درەنـگ یـان زوو دەمریـت، تەنانـەت ئەگـەر خواسـتی تـۆ شـتیکی تریـش بیـت یـان تەنانـەت ئەگـەر ئـەو کاتـە ئارەزووگەلیکیشت لەدلدا بیت.

"بـەقولی بـیر لـەو شـتە بکـەرەوە کەئـەمرۆ یـان سـبەی یـان لـەوباقی تەمـەنتدا ئەنجامی دەدەیت."

٣١

دۆزەرەوەیەکی سپی پیست کەبۆ گەیشتن بەئامانجەکەی لەجەرگەی ئەفریقادا پەلەی بوو، بەلینی بەبار هەلگرەکانیدا کەئەگەر خیراتر برۆن، کرییەکی زیاتریان بداتێ. بار هەلگرەکان چەند رۆژیك بەهەنگاوی خیرا تر رۆشتن، بەلام رۆژیك پاش نیوەرۆ بارەکانیان خستو دانیشتن. دۆزەر هەرچی نرخی کرییەکەی بردە سەرەوە، بەلام بار هەلگرەکان لە دریژەدان بەرۆیشتن سەرپیچییان کرد. سەرئەنجام دۆزەر هۆی ئەم رەفتارەیانی لیپرسین. یەکێ لەبار هەلگرەکان وەلامی دایەوە: "ئیمە ئەوەندە خیرا بەریدا هاتووین کەئیدی نازانین چی دەکەین. ئیستا دەبیت بریك رابوەستین تا رۆحمان پیمان بگاتەوە.

٣٣

خـاتوونی ئیمــه لـەحالیکدا کەعیسـای چکۆلـەی لەباوەشـدا بـوو، بۆسـەردانی پەرستەگەیەك هاتە سـەر زەوی. رۆحانییـەکان بـۆ دلخۆشـکردنی ئـەوان لـەریزیکدا بــەریکی وەسـتان تادیارییـان پیشـکەش بکـەن. یـەکێ لەرۆحانیـەکان شـیعریکی بـەدەنگیکی سـەروادارەوە خوینـدەوە، یـەکیکی تریـان وینەگـەلیکی زیرپۆشـکراوی ئینجیلی پیشاندان، یەکیکی تریشیان ناوی سەرجەمی قەدیسەکانی گوت.

لـەکۆتایی ریزەکـەدا، رۆحانییـەکی بـیٚفیزو سـەنگین بـوو، کەهـەرگیز هـەلی بـۆ هەلنەکەوتبوو سوود لە هۆشمەندانی سەردەمەکەی خۆی وەربگریت. دایـكو بـاوکی خەلکانیکی ئاسایی بوون کەلە سیرکیکی گەرۆکدا کاریان دەکرد. کاتێ نۆرە گەیشتە سەر ئەو، رۆحانییەکان لەترسی ئـەوەی نـەکا عـەیباریان بکات، بریاریـاندا کۆتـایی مەراسیمەکە رابگەیەنن .

بـەلام ئـەویش دەیویست خۆشەویستی خـۆی بـۆ پـاکیزە دەربـبریٚ. پەشـۆکاوو سەراسیمە لەنارەزایـەتی براکـانی، چـەند پرتـەقالیکی لـەگیرفانی دەرهینـاو دەسـتی کرد بە ئەنجامدانی ئەو کارە دەستسوکیانەی دایكو باوکی فیریان کرد بوو.

تەنیا لـەو کاتـەدا بـوو کەعیسـای چکۆلـە زەردەخەنەیـەکی هینایـە سـەر لیـویو بەخۆشحالییەوە چەپلەی لیدا. کەنیشکەش تەنها ریگەی بەقەشـە بـیٚ فیزەکـەدا بـۆ چەند ساتێ رۆلەکەی لەباوەش بگریت.

## ٢٣

هەوڵ مەدە هەمیشە مەنتقی بیت. سانت پاول[1] گوتویە: "ئـەقلی جیـهان لـەچاو خواوەنددا لەبێ ئەقلی‌یـەك بـەولاوە زیـاتر نییـە. "مـەنتقی بـوون بـەواتای ئـەوەی کەهەر رۆژەی بۆینباخێ ببەستی کەلەگەڵ گۆرەوییەکانتدا بگونجیت. واتەی ئەوەی کەسبەی هەمان ئەو بیرو بۆچوونانەت هەبیت کەئەمرۆ هەتە. کەواتـە سـورانەوەی زەوی ناو دەنیی چی؟ تائـەو کاتـەی کەنابیتـە مایـەی زیـانی ئـەوی تـر، هـەزار جـار بیروباوەرەکـانت بگـۆرە. بـــەبێ ئـــالۆزکردنی بارودۆخـــەکان، خـــۆت رووبـــەرووی لیکدژیگەلیك بکەرەوە.

ئەمە مافی تۆیە. گرنگ نـیـە خەلکانی دی چۆنی بیر دەکەنـەوە. هـەرکاریکیش بکەیت، ئـەوان هـەر خەیالـگەلیکیان بەسـەردا دیـت. چیـژی سەرسـورماندنی خـۆت بدۆزەرەوە.

سـانت پـاول گوتویـە: "خواوەنـد بابەتگـەلیکی گەمژانـەی بـۆ سەرسـام کردنـی خەلکانی هۆشمەند هەلبژاردوە."

[1]. Saint paul

## ٢٤

پیر دەلیت:

"ئەمرۆ بۆ دەست بردن  بۆ کاریکی نائاسایی رۆژیکی باشە. بۆ نمونە دەتوانین لەکاتی رۆشتندا بۆ سەر ئیش لەسەر شەقامەکەدا سەما بکەین. دەتوانین  چاو ببرینە چاوی غەریبەیەك و لەبارەی عەشقەوە لەگەلیا بدویین. دەتوانین پلانیکی نوێ بدەینە سەرۆك کەگالتەجار بیتە بەرچاو. ئەوانەی بەدوای روناکیدا دەگەرینو شەری لەسەر دەکەن، ریگە بەخۆیان دەدەن رۆژگەلیکی ئاواهییان هەبیت.

"ئەمرۆ دەتوانین بۆ یادەوەرییەکی تالّ کەهیشتا دلمان ئازار دەدات ئەسرین بریژین. ئەمرۆ دەتوانین مایکی تەلەفۆن هەلبگرین و پەیوەندی بەکەسیکەوە بکەین کە پەیمانمان بەخۆمان دابوو هەرگیز قسەی لەگەلدا نەکەین، ئەو کەسەی کەحەزدەکەین رۆژیك لەپەیامگیری تەلەفۆنەکەمانەوە پەیامیکی ئەومان بەدەست بگات.

"ئەمرۆ دەتوانیت رۆژێ بیت جیاواز لەرۆژە ئاساییەکان. ئەمرۆ هەموو گوناه و هەلەکان قبولّ دەکری و لیدەبوردری. ئەمرۆ رۆژیکە بۆ چیژ وەرگرتن لەژیان."

(رۆجەر پیمرۆز)[١]ی زانا لەگەڵ ژمارەیەك لەدۆستانیدا، لە شەقامیکدا پیاسەی دەکرد و بەگەرمییەوە قسەی دەکرد. تەنیا ئەو کاتەی کە دەیانویست لەشەقامەکە بپەرنەوە بیدەنگ دەبوو.

پیمرۆز گوتی: "بیرمە جاریك خەریك بووم لەشەقامێ رەت دەبووم، ئەندیشەیەکی سەیر کەباوەر نەدەکرا، بەمیشکمدا ختورەی کرد. بەڵام هەر ئەوەندەی گەیشتمە ئەوبەری شەقامەکە، دووبارە گەرامەوە بۆ ئەو شوینەی کەدەستم پێکرد بووو نەمتوانی ئەو شتە بەبیری خۆم بهینمەوە کەچەند ساتێ لەوە وپیش بەمیشکمدا ختورەی کرد بوو."

دەمەو شیوانی ئەو رۆژە بیهۆ هەستیکی خۆش پیمرۆزی داگرت. ئەو گوتی: "هەست دەکەم مەسەلەیەکم بۆ روون بۆتەوە."

بریاریدا چاوبخشینیتەوە بەسەر تاك تاکی دەقیقەکانی ئەو رۆژەدا، کاتێ بەو ساتە گەیشت کەخەریك بوو لەشەقامەکە دەپەرییەوە، ئەندیشەکە دووبارە گەرایەوە. ئەم جارەیان نوسی، ئەویش تیۆری تونە رەشەکان بوو، تیۆریکی شۆرشگیرانە لەجیهانی فیزیکی نویدا.

ئەو ئەندیشەیە گەرایەوە بۆلای ئەو، لەبەرئەوەی کەئەو دەیتوانی پەی بەو بیدەنگیە بەرێ کەئیمە بەردەوام لەکاتی پەرینەوە لەشەقامدا هەلیدەبژیرین.

---

[١]. Roger Pemrose

## ٣٦

سانت ئانتۆن[١] لەبیابانیکدا دەژیا، رۆژێ لاوێ هاتە لای.

لاوە گوتی: " باوکە من هەرچیم هەبوو فرۆشتم و پارەکەیم بەسەر هەژاراندا بەخشیەوە. تەنیا ئەو شتگەلە کەمەم هیشتەوە کەیارمەتیم دەدەن لیرە ژیان بگوزەرینم. دەمەویت ریگەی رزگاریم پیشان بدەیت."

سانت ئانتۆن داوای لەلاویژگەکە کرد کە شتە کەمەکانیش بفرۆشیت و لەشار هەندێ گۆشت بکریت و لەگەرانەوەدا گۆشتەکە بەلەشیەوە ببەستێ.

لاوە بەپیی فرمانەکە کاری کرد. لەریگەی گەرانەوەدا، سەگ و دالەکەرخۆرەکان کە گۆشتیان دەویست شالاویان بۆ هینا.

کاتێ لاوە گەرایەوە، لەشی بریندار و جلوبەرگی پارچە پارچە بووی خۆی بەباوکە نیشان داو گوتی: "من گەرامەوە"

قەدیس گوتی: "ئەو کەسانەی ریگەیەکی نوێ دەگرنەبەر، بەلام دەیانەویت تۆزقالێ لەژیانی پیشوویان لەگەلدا بمینیتەوە، ئەوا رابردوویان ئازاریان دەدات."

---

١. Saint Anton

٣٧

پیر دەلیت:

"لەتەواوی ئەو بەهرانەی کەخواوەند ئـەمرۆ بـەتۆی بەخشیوە بەهرەمەندبـە. ناتوانریٚ بەهرە پاشەکەوت بکریت. ئەمباریك بوونـی نیـیە، کـەبتوانریت بـۆ رۆژی پیویست بەهرەکانی تیادا ئەمبار بکریٚ. ئەگـەر سـوود لەوانـە وەرنـەگری، ئـەوا بـۆ هەمیشە لەدەست دەردەچن.

"خواوەنـد دەزانـیٚ کەئەگـەر پـیٚ بخاتـە ژیانمانـەوە، دەبینـە هونەرمەندگـەلیکی داهینــەر. رۆژیــك گلمــان دەداتــیٚ پەیکــەر دروســت بکــەین. رۆژیکــی تــر فلچــەو لەوحەمان دەداتیٚ. ئیمـە هـەرگیز فلچە لەسـەر گلەکـەو گلەکـە لەسـەر لەوحەکـەدا بەکار ناهینین.

"هەر رۆژەو موعجیزەی تایبەتی خۆی هەیە. بابەهرەکانی ئەمرۆ قبولْ بکـەین و بەکاری بینین.

"سبەی بەهرەگەلیکیتر چاوەروانمان دەکات."

## ٣٨

پەرستگەی کەناری روباری پیدرا[1] بەگژوگیایەکی جوان دەورە دراوە، میرگیکی راستەقینەی دەشتە بی بەرەکەتەکانی ئەو بەشەی ئیسپانیایە. لەویدا روباریکی بچوك دەبی بەرەوتیکی بەتەوژم و دەرژیتە دەیان تاڤگەوە.

نوسەر لەو ناوەدا پیاسەی دەکردو گویی لەمۆسیقای ئاو دەگرت، لەپر ئەشکەوتی پشتەوەی یەکی لەو تاڤگانە سەرنجی وی بۆلای خۆی راکیشا. لەو بەردانە وردبووەوە کە بەتیپەرینی کات رزیبوون هەروەها لەوشکلە جوانانەی کەسروشت بەئارامی خەلقی کردبوون. بەچاوی بەدڵ بوونەوە تەماشای دەکردن، نوسەر کەوتە یادی بەیتە شیعریکی ر. تاگور[2] کەلەسەر لەوحیك هەلکۆلرا بوو:

"ئەم گابەردانە چەکوش وا بەباشی نەیتاشیون، بەلکو ئەوە ئاوە ئەم کارەی کردوە - بەنەرمیو سەماو ئاوازییەوە."

لەو شوینەی کەهیز دەتوانیت تەنیا بکوژێ و ببرێ، نەرمو نیانی دەتوانێ رۆلی ئافەرۆز کردن بگیرێ.

---

[1]. Piedra
2. R. Tagore

٣٩

پیر دەلیت:

"زۆریك لەخەلكی ترسیان لەشادبوون هەیە. وەها خەلكیك، رازی بوون لەژیان لەگۆرینی چەند خوونەریت و فەرامۆشكردنی مانای ناسنامەدا دەبینن.

"زۆرتر، ئەو روداوە باشانە ئیمە ئازار دەدەن و ئیمە سوودیان لی نابینین، لەبەر ئەوەی پیمان وایە بەقبولٚ كردنی ئەوانە قەرزاری خودا دەبین.

"بیر دەكەینەوە: واباشترە كەجامی شادی هەلنەدەین، لەبەر ئەوەی كاتیك جامەكە خالی بووەوە، رەنجیكی زۆر دەبینین.

"بەبێ ترس لەورد بوون ، گەورە بوون مانای نییە. بەبێ ترس لەگریان، ناتوانین پیبكەنین."

٣٥

دەمـەو ئیوارەیـەك، لەپەرسـتگەی سـیتا، یـەکێ لەراهیبـەکان راهیببکـی تـری رەنجاند. گـەورەی پـەرسـتگەکە، بـرا سـیزویس، داوای لەراهیبـە رەنجاوەکـە کـرد لەبراکەی ببورێ.

راهیب گوتی: "ئەم کارە لەمن ناوەشیتەوە. ئەو بـوو سـوکایەتی کـردو ئیستاش دەبیت ئەو باجەکەی بدات.

لەوساتەدا، برا سیزیوس دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە و گوتی: " ئـەی عیسای من، ئیمە چیدی پیویستمان بەتۆ نییە. دەتوانین سزای دەستدریژیی دەستدریژکەر بدەیـن. دەتوانـین بەدەسـتی خۆمـان تۆلـە بسـتینینەوە. دەتوانـین دادوەری لـەنیوان خـیرو شـەردا بکـەین. ئیسـتا ئیـدی دەتوانـی بەخـەیالیکی ئاسـوودەوە ئیمـە بـەجێ بهیلی، لەبەر ئەوەی ئیستاو دوا هیچ کیشەو گرفتێ نایەتە پیش."

راهب، شەرمگین ، بێ سێو دوو لەبراکەی خۆش بوو.

٣١

دەرویش (سالك، پارسا، سۆفی) یك گوتی: "پیران هەموویان دەلێن گەنجی مەعنەوی لەگەڕانی بەتەنهادا بەدەست دیت. ئەگەر وەهایە ئیمە بۆلە دەوری یەك کۆبووینەتەوە؟"

پیر وەڵامی دایەوە: " هەمیشە دارستان لەدرەختی تاك بەهێزترە. دارستان لەنیو خۆیدا شێ رادەگرێ، لەبەرامبەر تۆفاندا خۆی رادەگری و خاك بە بەپیتی دەهیلیتەوە. ئەمەیە هۆکاری کۆمەڵایەتی بوونی ئیوە. بەڵام ئەوەی کەدرەخت پتەوو بەتوانا دەکات رەگەکانیەتی، رەگو ریشەکانی گیا ناتوانێ یارمەتی پیگەیشتنی ئەوی تر بدات.

"یەکگرتن بۆ ئامانجیکی تایبەت، بەو مانایەیە کەریگە بەهەموو کەسێ بدەین بەشیوازی خۆی لەئامانج نزیك بیتەوە و ئەمە ریگەی کەسانیکە کەدەیانەویت لەگەڵ خوادا لەپەیوەندیدا بن.

٣٣

ئەو کاتەی کەنوسەر تەمەنی دەساڵ بوو، لەسەرداواو پیداگری دایکی بەشداری وانەی وەرزشی کرد، یەکێ لەبەرنامەکانی ئەم وانەیە، خۆ هەلدان بوو لەسەر پردیکەوە بۆناو روبارەکەی ژیر پردەکە.

رۆژانی یەکەم، ترس ئەوی وشك دەکرد. ئەو هەموو رۆژێ لەدوا دوای ریزەکەوە دەوەستاو لەگەڵ خۆهەلدانی هەر هاوپۆلیکیدا دلە تەپەکەی زیاتر دەبوو، لەبەر ئەوەی بەزویی نۆرەی ئەویش دەگەیشت.

رۆژیك راهینەرەکە بەترسەکەی ئەوی زانیو ناچاری کرد لەپیش هەموویانەوە خۆی هەلبدات، سەرباری ئەوەی کەهیشتا دەترسا، ترسەکەی وەها بەخیرایی رەوییەوە شوینی خۆی بۆ جورئەتو ئازایەتی چۆڵ کرد.

پیر دەلیت: "ئاسایی، بۆ دەستی دەستی کردن بوارمان هەیە، بەلام کاتو ساتێ دینە پیشێ کەدەبیت قۆلی لی هەلمالینو کیشەیەك چارەسەر بکەین. لەم ساتانەدا، هیچ شتێ لەدرەنگ کردن خراپتر نییە."

## ٣٣

دەمەوبەیانییەك بودا لەنێو قوتابیەكانی‌دا بوو پیاوێك لەكۆڕەكەیان نزیك بووەوەو پرسی: "ئایا خودا هەیە؟"

بودا وەڵامی دایەوە: "بەڵێ، خودا هەیە؟"

پاش نیوەڕۆ پیاوێكی دی هاتو هەمان پرسیاری دووبارە كردەوە.

بودا وەڵامی دایەوە: "نەخێر، خودا نییە."

شیوان پیاوێكی تر هاتو دیسان هەمان پرسیاری دووبارە كردەوە.

بودا ئەمجارە وەڵامی دایەوە: "تۆ خۆت دەبیت وەڵامی ئەم پرسیارە بدۆزیتەوە."

یەكێ لەقوتابییەكان گوتی: "مامۆستا، ئەمە بێ مانایە. چۆن دەشێت پرسیارێك سێ وەڵامی هەبێت؟"

پیاوی دەرون روناك وەڵامی دایەوە: "لەبەر ئەوەی ئەوان سێ كەسی جیاواز بوون و هەر كەسە بەشێوازی خۆی لەخوا نزیك دەبیتەوە، یەكێك بەدڵنیاییەوە، ئەوی دی بەنكوڵی كردن، سێهەمیش بەگومانەوە."

## ٣٤

هەمووماندەرگیری مەسەلەگەلیکین لەبابەتی بریاردان، دەست بەکاربوون، چارەکردنی گرفتەکانو یارمەتی دانی خەلکانی تر. بەردەوام دەکۆشین نەخشەیەك بکیشین، شتیك وەبەربینینو شتیك ئاشکرا بکەین.

هیچ شتیکی نادروست لەم کارانەدا نییە. بەلاّم پاشی هەموو ئەم قسانە، ئەمە شیوەیەکە کە ئیمە بەهۆیەوە جیهان خەلقو چاکسازی دەکەین. هەموو شتێ بەجیی خۆی، بەلاّم کاری ستایش کردنیش بەشیکە لەژیان، جاروبار راوەستان، لە دەروون هەلاّتن، بێ دەنگی کردن لەبەرامبەر مەزنی بووونداو چۆك دادان بەگیانو جەستە بەبێ داواکردنی هیچ شتێ، بێ بیرکردنەوەو تەنانەت بێ دەربرینی سوپاسگوزاری بۆ هیچ شتێ - تەنیا ئەزموونی گەرمیی عەشقیکە کەئیمەی لەخۆ گرتووە. لەساتو وەختیکی ئاوادا رەنگە فرمیسکگەلیکی نەویستراو بەگۆناماندا بخزیتە خوارێ، فرمیسکگەلیك کەنەباس لەغەم دەکەنو نە لەشادی. سەرسام مەبە. فرمیسك بەهرەیەکە کەگیانی ئیمە پاك دەکاتەوە.

## ٣٥

پیر دەلیت:

"ئەگەر ناچاریت بگریت، وەکو منداڵ بگری.

"تۆ سەردەمیك منداڵ بوویت، یەکێ لەو شتە بەراییانەی فیری بوویت گریان بووە، لەبەر ئەوەی گریان بەشیکە لەژیان. هەرگیز بیرت نەچێ لەئاشکراکردنی هەستو نەستتدا ئازادی و گریان هیچیان شەرم هینەر نین.

"هاوار بکە. بەدەنگی بەرز هەنسك هەلریژە و هەرچۆنیك دەتەویت هەراو هوریا بەریبخە، لەبەر ئەوەی منالان بەم شیوەیە دەگرین و خیراترین ریگەی هیورکردنەوەی دڵ دەزانن.

"قەت سەرنجت داوە منداڵان چۆن چۆنی لەگریان ژیر دەبنەوە؟ بیگومان شتیك هەستی ئەوانی لەگریان پەرت کردووەو ئەوانی بۆ گۆبەنو گیچەلی دواتر بانگهیشت کردوە.

" گریانی منداڵان زۆر زوو تەواو دەبیت.

"بۆ تۆش هەروا دەبیت، بەلام ئەگەر دەتوانی وەکو منداڵان بگریت، ئەوا وابکە."

## ٣٦

رۆژیك نوسەر لەگەڵ هاورییەکیدا کەخاتونیکی پاریزەر بوو لەفۆرت لادردیل[١] نانی نیوەرۆی دەخوارد. مەستیك کەلەسەر میزەکەی تەنیشتیان دانیشتبوو، بەدریژایی نان خواردنەکە پیی دادەگرت لەگەڵ ژنەدا قسە بکات. ناچار ژنە پاریزەرەکە داوای لەمەستەکە کرد بیدەنگ بیت، بەلاّم ئەو گوتی: " بۆچی؟ من جۆریك لەبارەی عەشقەوە قسە دەکەم کەهیچ مرۆڤیکی هوشیار وانایکات. من خۆشحالم. دەمەویت لەگەڵ نەناسیاوەکاندا پەیوەندی دامەزرینم. کویی ئەم کارە هەلەیە؟"

ژنە گوتی: "ئیستا کاتیکی گونجاو نییە."

کابرای سەرخۆش گوتی: " مەبەستتان ئەوەیە کاتگەلیکی تایبەت بۆ دەربرینی شادی هەیە؟"

بەگوتنی ئەم رستەیە، کابرای مەست بۆسەر میزەکە بانگهیشت کرا.

---

١. Fort Lauderdale

پیر دەڵیت:

"ئیمە دەبیت ئاگامان لەلەشی خۆمان بیت. جەستە قەڵای گیانی پیرۆزەو شایستەی ئەوەیە لوتفی پیبکەین‌و ئاگامان لیببیت.

"ئیمە دەبیت باشترین سوود لەکاتی خۆمان وەربگرین. دەبیت لەپیناوی خەونەکانماندا بجەنگین. پیویستە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە هیزمان کۆبکەینەوە.

" بەڵام نابیت بیرمان بچیت کەژیان لەخۆشییە بچوکەکان پیکهاتووە ، ئەم خۆشیانە لەژیانی ئیمەدا ئامادە کراون تاجورئەت‌و ئازایەتیمان بدەنی، لەگەراندا یاوەرمان بن و ئەوکاتەی لەتیکۆشانی رۆژانە ماندووین، هەلیك بۆ نویکردنەوەی هیزمان فەراهەم بکەن.

"شاد بوون گوناه نی‌یە. کیشە نی‌یە گەر جاروبار بەرنامەکانی خواردن‌و خەوو سەیران بخەینە ژیر پیوە.

"خۆت سەرزەنشت مەکە گەر هەندی جار کاتی خۆت لەگەل لیبۆکەکاندا بەفیرۆ دەدەیت. ئەم کارانە خۆشیگەلیکی چکۆلەن کەتۆ بۆ کارگەلیکی گەورە هاندەدەن."

## ٣٨

(ئـارتۆر رۆبینشـتاین)[١]ی پیـانۆ ژەن، لەگەیشـتن بەمـــەوعیدی نـــانی نیـــوەرۆ لەچیشتخانەیەکی پلەیەکی نیویۆرك درەنـگ کـەوتبوو. هاوریکـانی هیـواش هیـواش نیگەران دەبوون. بـەلام سـەرئەنجام سـەروکەلەی رۆبینشـتاین دەرکـەوت، لـەباریکدا کچیکـی سەرنجراکیشـی لەگـەل بـوو کـە سـیـیەکی تەمـەنی خـۆی بـوو. رۆبینشـتاین هاوریکـانی بـەداواکردنی گرانـترین خواردنـی چیشـتخانەکەو چاکـترینو نایابـترین شەراب سەرسام کرد. کاتی فراوین تەواو بوو، بەزەردەخەنەوە پارەکەی دا.

رۆبینشتاین گوتی: "دەبینم هەموو سەرتان سوورماوە. بەلام ئەمرۆ من چوومە لای پاریزەرەکـەم تـا وەسـیـەتنامەکەم ریکبخـەم. بریکـی باشـم بـۆ کـچو خزمـــەکانم لەبـەرچاوگرتو ژمارەیـەکی سەخاوەتمەندانەیشـم بـۆ خـیرو بـیریش خسـتەلاوە. بەلام لەپر هەستم کرد لەوەسیتنامەکەدا خۆمم لـەبیرکردوە و هـەموو شـتەکان درا بەکەسانی تر. هەربۆیە بریارمدا لەپەیوەند بەخۆمەوە سەخاوەتمەندتر بم."

---

[١]. Arthur Rubinstein

ئەو کاتەی پـیر بەمەبەسـتی بلاوکردنـەوەی خواپەرسـتی لەگەشـت دا بـوو، ئـەو ماڵەی کەئەوو قوتابیەکانی تیایدا دەژیان ئاگری تیبەربوو.

یــەکی لەقوتابییــەکان گوتــی: "ئــەو ماڵەکــەی بەئیمــە ســپاردو ئیمــەش لەئەرکەکەماندا کەمتەرخەمیمان کرد."

قوتابیەکان یەکسەرو بی وەستان دەسـتیان کـرد بەدروست کردنـەوەی ماڵەکە. بـەلام پـیر لـەپیش کـاتی دیـاریکراوی خـۆی لەسـەفەر گەرایـەوەو قوتابیـەکانی لـەو حاڵەدا بینی.

پیر بەکەیفخۆشییەوە گوتی: " ئاوا! مالیکی تازە!"

یەکی لەقوتابییەکان بەپەشۆکاوییەوە هـەولیدا کارەسـاتی راسـتەقینەی سـوتانی ماڵەکە باس بکات کەهەمووان پیکەوە تیایدا دەژیانو خویان پیوە گرتبوو.

پیر گوتــی: "مـن تیناگـەم. ئـەوەی کـەمن دەیبینـم، پیـاوانیکن باوەریـان بـەژیان هەیە و قۆناغیکی نوییان دەست پی کردوە. ئەوانـەی کەهـەموو شـتیکیان لەدەسـت داوە، لەچاو ئەوانی تردا پیگەیەکی باشتریان هەیە، لەبەرئـەوەی بۆئـەوان، لەوسـاتە بەدواوە، بارودۆخ تەنها دەتوانیت باشتر ببیت."

پیر دەلیت:

"کە بەشەقامی خەونەکانتدا هەنگاو دەنییت، دلی پی بدە و دەرگایەك بۆ بەهانەگەلیکی وەکو " ئەمە ئەوە نییە کەمن دەمویست " بەکراوەیی مەهیلەرەوە، چوون لەم کارەدا تۆوی شکستو ناکامی حەشاردراوە.

"بەریی خۆتدا هەنگاو بنی، تەنانەت ئەگەر ناچاریش بیت هەنگاوگەلیکی نادلنیاش هەلبینی، هەتا ئەگەر بزانی لەمەش باشتر دەتوانی ئەم کارە ئەنجام بدەیت. ئەگەر تواناییەکانت لەئیستادا قبول بکەیت، گومانی تیدا نییە لە ئایندەدا دەتوانی چاکیان بکەیت، بەلام ئەگەر لەقبول کردنی کەموکوریەکانت سەرپیچی بکەیت، ئەوا هەرگیز ناتوانی لەشەرو بەلایان رزگاربی.

"بەئازایەتییەوە روبەروی ریگەکەت بەرەوەو لەسەرزەنشتی کەسانی دی دلت نەترسی. لەوەش گرنگتر ئەوەیە کەخۆیشت سەرزەنشت مەکە و بەم جۆرە توانای خۆت بەفیرۆ مەدە.

"خواوەند لەشەونوخونیەکانتدا لەگەل تۆدایەو فرمیسکەکانت بەعەشقی خۆی پاك دەکاتەوە. خواوەند لەگەل خەلکی دلیردایە."

٤١

پیرو موریدەکانی لە گەشتدا بوون و لەریگە نەیاندەتوانی خواردنیکی بەدلی خۆیان بخۆن. پیر چەند کەس لە موریدەکانی بەدوای خواردندا نارد.

کاتی خۆرئاوا بوون موریدەکان گەرانەوەو هەریەکەیان چەند شتیکی کەمیان هینایە پیش کە لەخیرو سەدەقەی خەلك کۆیان کردبووەوە: میوەگەلیك کەخەریك بوون دەگەنین، نانی پەزیرو شەرابی تال.

بەلام یەکی لەموریدەکان کیسەیەك سیوی گەیوی پی بوو.

لەحالیکدا کیسە سیوەکەی بەسەر موریدەکاندا دابەش دەکرد گوتی: "من لەپیناوی یارمەتی دانی پیرو براکانمدا دەست بۆ هەموو کاریك دەبەم."

پیر پرسی: " ئەمانەت لەکوی هیناوە؟"

مورید وەلامی دایەوە: "ناچار بووم دزی بکەم. خەلکی لەگەل ئەوەشدا کەدەیانزانی خواپەرستی بلاو دەکەینەوە، خواردنی خراپ بوویان دەداینی."

پیر گوتی: "برۆو سیوەکانت لەگەڵ خۆتدا ببەوەو هەرگیز نەگەرییتەوە. کەسی لەپیناوی مندا دزی بکات، دزی لەمنیش دەکات."

٤٣

ئیمە لەدنیادا بەدوای پەسنی جیخواست و خەونەکانمان دەکەوین، زۆربەی جار ئەوەی بەسانایی لەبەردەستماندایە ، وەك شتیکی نایابو دانسقە سەیری دەکەینو لیکیدەدەینەوە. کاتی بەهەلەکە دەزانین، هەست دەکەین کەکاتی خۆمان بە فیرۆداوە. ئاولەگۆزەماندا بووە و بەتینویتی گەراوین. لەبەر هەلەکانمان و گەرانی بی هودەو مەسەلەگەلیك کەدروستمان کردوە خۆمان تۆمەت باردەکەین.

پیر دەلیت:

"رەنگە گەنج (خەزنە) لەمالەکەی خۆتدا شارابیتەوە، بەلام تەنیا ئەو کاتە بەدەستی دەهینی بەدوایدا گەرابیت. گەر پەترۆس ئازاری تەکفیری نەچیشتبوایە بۆسەرۆکایەتی کلیسا هەلنەدەبژیردرا. ئەگەر کوری دەست بلاو دەستی لەکاروکردەوەکانی هەلنەگرتبایە، باوکی دەستخۆشی پینەدەگوت.

"شتگەلیك لەژیاندا هەن ناوو ناوەتۆرەیان لەسەرە بەم مانایە:

( تۆ قەدری من نازانیت، مەگەر لەدەستم بدەیتو دووبارە بەدەستم بهینیتەوە.) کۆشش کردن بۆ کورتکردنەوەی ریگا سوودیکی نییە."

## ٤٣

پــیریك چــاوی بەقوتابییــەكی ئــازیزی كـــەوت و لەپیشــكەوتنی موریدەكـــەی لـەریبازی مەعنـەویدا، پرسـیاری كـرد. قوتـابی وەلامـــی دایـــەوە كەئیســتا دەتوانـــی هەموو ساتەكانی ژیانی بۆ خوا تەرخان بكات.

پیر گوتی: "كەواتە تەنیا ئەوە ماوە كـە لەوانـە خـۆش ببیت كەخراپـەی تۆیـان دەوی.

قوتابی سەرسامانە سەیریكی مامۆستاكەی كـردو گوتـی: "ئـەم كـارە بەپیویسـت نازانم. ئاخر من هیچ نیەتیكی خراپم لەبەرامبەر ئەواندا نـی‌یە."

پیر گوتی: "ئایا پیتوایە كەخواوەند هیچ بەدنیازییەكی بەرامبەر تۆ هەبیت؟"

قوتابی گوتی: "هەلبەتە كە نا."

پـیر گوتـی: "بـەلام سـەرباریش تـۆ داوای لیبوردنـی لی دەكـەیت. ئایـا وا نییـە؟ كەواتـە لەگـەل ئەوانەیشـدا كەخراپـەی تۆیـان دەوی ئاوهـا بكـە، تەنانــەت ئەگــەر لەبەرامبەریشیاندا بەدنیاز نیت. ئەوەی كە دەبـوری، دلـی خـۆی دەشـواتەوەو پـاكی دەكاتەوە."

٤٤

لەکاتی بۆمببارانی دلرەقانەی (تۆلۆن)[١]دا ناپلیۆنی لاو وەك شۆرەبی یەکبەخۆی دەلەرزی.

سەربازیك کە ئەوی لەم بارەدا بینینی بەهاوریکەی گوت: (سەیری بکە! تائاستی مردن ترساوە!).

ناپلیۆن وەلامی دایەوە: (بەلێ. من ترساوم، بەلام بەم حالەشەوە دریژە بەشەر دەدەم. ئەگەر ئیوە نیوەی من ترستان هەبووایە، دەمیك بوو هەلاتبوون).

پیر دەلیت:

(ترس نیشانەی ترسنۆکی نییە. ترسە توانامان دەداتێ لەبەرامبەر پیگەکانی ژیاندا ئازاو بەویقار بین. کەسێ کەترس تاقی دەکاتەوە، بەلام سەرباری ترسەکەی بۆ پیشەوە دەرواتو ریگە بەترس نادات رایوەستینێ، ئازایەتی خۆی دەسەلمینێ. بەلام کەسێ کەبەبێ لەبەرچاو گرتنی مەترسی، لەگەڵ هەلومەرجە دژوارەکاندا دەستەو یەخە دەبێ، تەنیا نابەرپرسیاری خۆی پیشان دەدات.).

[١]. Toulon

٤٥

نووسەر لەجەژنی (سانت جۆن)[1] دا بەشداری کردبوو و لەنیو چادرەکاندا سەرقالی تەماشا کردنی پیشبرکیی نیشانە گرتنەوەو خواردنی خۆراکە خۆمالییەکان بوو. لەپر لیبۆك(مهرج)یَ دەستی کرد بەلاسایی کردنەوەی رەفتارەکانی ئەو. خەلکی پیکەنین. نووسەریش پیکەنیو کابرای لیبۆکی بۆ قاوە خواردنەوە بانگهیشت کرد.

لیبۆك گوتی: (دڵ بدەرە ژیان. ئەگەر زیندویت، دەبیت دەستەکانت بجولینی، هەلبەزیتو دابەزی، دەنگە دەنگ بکەیتو لەگەڵ خەلکدا قسە بکەیت. لەبەرئەوەی ژیان ریك خالی بەرامبەر مردنە. مردن واتە مانەوەی هەتاهەتایی لەیەك دۆخدا، ئەگەر زۆر کزو بیَ دەنگ بیت زیندوو نیت).

[1]. Saint john

٤٦

بەیانییەکیان پیریك و موریدی لەدەشتیکدا پیاسەیان دەکرد. مورید لەبارەی رژیمیکی خۆراکیەوە پرسیاری لەپیر کرد کەیارمەتی پاکیزەیی دەرونی بدات. هەرچەندە پیر چەندەهاجار جەغتی لەوە کردبووەوە کەخواردنیکی پیرۆزی تایبەت بوونی نییەو هەموو خواردنەکان لەم رووەوە وەکو یەك وان، بەلاّم مورید باوەری بەم قسانە نەبوو.

مورید گوتی: ( دەبیت خواردنێ هەبیت کەمرۆڤ لەخودا نزیك تر بکاتەوە )

پیر گوتی: ( رەنگە راست بکەیت ، بۆنموونە ئەم قارچکانە )

بیرۆکەی ئەمەی کەخواردنی قارچك یارمەتی ئەو دەدات بۆ پاك بوونەوەو زەوقی پی دەبەخشیت، موریدی هەژاند. بەلاّم هەرئەوەندەی ویستی یەکیکیان هەلبگریت ، بەترسەوە هاواری کرد: ( ئەم قارچکانە ژەهراوین، ئەگەر تەنانەت یەك دانەیشم لی بخواردنایە ، یەکسەر دەمردم )

پیر گوتی: ( باشە، بەلام من خواردنیکی دیکە پێ نازانم کە بەم خیراییە تۆ بباتە لای خودا ).

## ٤٧

لەزستانی ١٩٨١ دا، نووسەرو هاوسەرەکەی لەشەقامەکانی شاری (پراگ)[١]دا پیاسەیان دەکرد، کوریکیان بینی وینەی بالاخانەکانی ئەو ناوەی دەکیشا. نووسەر زۆر دلخۆش بوو بەوەی کەبینی، بریاریدا یەکێ لەوینەکان بکریت. کاتێ پارەی بەکورەکە دەدا، بینی کورە سەرباری سەرمای ٧ پلەی ژیر سفر دەستکیشی لەدەستدا نی‌یە. لەکورەی پرسی: (بۆچی دەستکیش لەدەست ناکەیت؟)

کورە وەلامی دایەوە : (بۆئەوەی بتوانم قەلەمەکەم بەدەستەوە بگرم)

قەدەریك پیکەوە لەبارەی پراگەوە قسەیان کرد. کورە پیشنیاری کرد کە بەخۆرایی وینەیەکی روخساری هاوسەری نووسەر بکیشیت. نووسەر کاتێ چاوەروان بوو وینەکیشانی کورە تەواو بیت، هەستی کرد روداویکی سەیر رویداوە، ئەو و وینەکیش نزیکی پینج دەقیقەیەك پیکەوە قسەیان کردبوو، بەبێ ئەوەی هیچ کامیکیان زمانی ئەویتریان بزانن. ئەوان تەنیا سوودیان لەجولەی سەرو دەستو زەردەخەنەو حالاتی دەمو چاو وەرگرتبوو. بەلام حەزی بەشداری کردن لەقسەکردن ریگەیدابوون پێ بنینە نیو دنیای زمانیکی بێ وشەوە.

---

[١]. Prague

# ٤٨

دۆستیك حەسەنی بردە بەر دەرگای  مزگەوتێ. لەوێ پیاویکی کویر سەرقالی سواڵ کردن بوو.

دۆستە گوتی: ( ئەم پیاوە کویرە ئاقلترین کەسی وڵاتی ئیمەیە )

حەسەن لەکابرای پرسی: ( چەندیکە نابینایت؟ )

پیاوە گوتی: ( لەو کاتەوەی هاتمە دنیا ).

حەسەن پرسی: ( چۆن چۆنی ئاوا هۆشمەند بووی؟ )

کابرا وەڵامی دایەوە: ( لەبەر ئەوەی کویرییەکەمم قبوڵ نەکرد. هەولم دا ببمە ئەستیرەناس. بەڵام لەبەر ئەوەی نەمدەتوانی ئاسمان ببینم ناچار بووم خۆرو هەسارەو کەهکەشانەکان لەمیشکمدا وینا بکەمو هەرچی لەدروستکراوەکانی خودا نزیکتر بوومەوە، لەئەقلی ئەو نزیکتر بوومەوە )

## ٤٩

خاوەنی مەیخانەیەك لەدییەكی دوورەدەستی نزیك شاری (ئۆلایـت)[١]ی ئیسـپانیا، تابلۆیەكی بەم ناوەرۆكەوە لـەوێ هەلواسـیوە: ( ریـك لـەو كاتـەدا كـەتوانیـم هـەموو وەڵامەكان بدۆزمەوە، هەموو پرسیارەكان گۆران )

پیر دەلیت:

( ئیمە بەردەوام لەبیری دۆزینەوەی وەڵامداین. هەست دەكەین بەدەست هینانی وەڵامەكان بۆپەی بـردن بـەمانای ژیـان زەرووریـە، بـەڵام لـەوە گرنگـتر ئەمەیـە كـە بەتەواوی دڵ بدەینە ژیانو ریگە بدەین هیواش هیواش رازەكانی بوونـی خۆمانمـان بۆ ئاشكرا بكات. ئەگەر زۆر بەدوای دۆزینەوەی ماناوە بین بـۆ بـوون، دەبینـە ریگـر لەبەردەم ئەوەی كەسروشت رۆلی خۆی بگیرێو ناتوانین پەی بەنیشانەكانی خـودا بەرین.)

---

١. Olite

## ٥٠

ئوستراللییەکان لەبارەی  کاهینیکەوە چیرۆکێکیان هەیە، کەرۆژێ، کاتێ لەگەڵ سێ دانە لەخوشکەکانی پیاسەی دەکرد، رووی بەرووی بەناوبانگترین شەرکەری سەردەمدا تەقییەوە.

شەرکەر گوتی: ( دەمەویت لەگەڵ یەکێ لەم کچە جوانانە زەماوەند بکەم )

کاهین گوتی: ( ئەگەر یەکێکیان زەماوەند بکات، ئەوا دوانەکەی تریان دەرەنجین. بەدوای خیلیکدا دەگەڕیم کەریگە بەپیاوەکانی بدا سێ ژنیان هەبیت )

سالانیك بەکیشوەری ئوسترالیادا گەڕان، بێ ئەوەی خیلیکی وابدۆزنەوە.

رۆژێ یەکێ لەکچەکان کەئیدی پیرو خەرەت ببوون، گوتی: (هیچ نەبیت یەکیکمان دەیتوانی شادمانی بەدەست بهینیت)

کاهین گوتی: (من هەلە بووم، بەڵام ئیستا ئیدی زۆر درەنگ بووە)

کاهین سێ خوشکەکەی کردە کۆمەلە بەردێ  تاهەر کەسێ بەلایاندا تیدەپەرێ بزانیت کەخۆشیو شادی نەفەریك بەو مانایە نییە کەدەبیت ئەوانیتر خەفەت بخۆن.

## ٥١

(والتــەر كــارل)[1]ی رۆژنامــەنووس، چـوو بـۆ چاوپیكـەوتن لەگـەڵ نووســـەری ئەرژەنتینی، خۆرخێ لویس بورخیس[2]، كاتێ چاوپیكەوتنەكە تـەواو بـوو، دەسـتیان كرد بەقسەكردن لەبارەی زمانیكەوە كە لەودیوی وشەكانەوە بوونی هەیە، هەروەها لەمەر توانای مەزنی مرۆڤەكان بۆپەی بردن بەكەسانی دی.

بۆرخیس گوتی: ( نموونەیەكتان بۆ دەهینمەوە )و بەزمانیكی سەیرو عـەجایب دەستی بەقسە كردن كردو پاشان لەرۆژنامەنووسەكەی پرسی كەچی گووتووە:

بەرلەوەی كارلی وەڵامیك بداتەوە، ئەو وینەگرەی كەلەگەلیا بوو، گوتی: (نزای " باوكی ئیمە " بوو )

بۆرخیــس گوتــی: ( ریــك‌و رەوان خۆیــەتی. مــن ئـــەوەم بـــەزمانی فنلــەندی خویندەوە. )

[1]. Walter Carelli
[2]. Jore Lois Borges

## ٥٣

دەستەمۆكەرانی ئاژەڵانی سیرك بەمەبەستی پیملكردنی فیلەكان سوود لەفیلیكی سادە وەردەگرن. ئەوكاتەی كەئاژەلەكە هیشتا بەچكەیە، یەكێ لەپییەكانی بەقەدی درەختیكەوە دەبەستنەوە. جوانە ئاژەڵ هەرچەند هەول دەدات ناتوانیت خۆی رزگار بكات. بەرەبەرە ئەو بروایە لەمیشكیا دەچەسپێ كەقەدی درەختەكە زۆر لەو بەهیزترە. كاتێ ئاژەلەكە پیگەیشت و بەهیز بوو، هیندە بەسە كەسیك سەرە پەتیك بەپێی فیلەكەوە ببەستێو سەرەكەی تریشی بەلقیكەوە گرێ بدات. فیلە هیچ هەولێ بۆ رزگار كردنی خۆی نادات.

پیی ئیمەش، هەروەكو فیلەكان، زۆرتر بەدەزوگەلیكی لاوازو باریكەوە بەستراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی لەمندالیەوە باوەرمان بەبەهیزی درەختەكە كردووە، جورئەتی هەولدان نادەینە بەر خۆمان، بێ ئاگا لەوەی كەبۆ بەدەست هینانی ئازادی، كردەوەیەكی ئازایانە بەسە.

پیر دەلیت:

( گەران بەدوای روون کردنەوەو شیکردنەوەیەك بۆخواوەند، شتیکت پێ ناگەیەنیت، دەتوانی گوێ لەوشەی جوان جوان بگری، بەلأم لەراستیدا ئەوانە بۆشن. وەکو ئەوە وایە کەدانیشیتو سەرتاسەری ئینسایکلۆپیدیایەك لەبارەی عەشقەوە بخوینیتەوەو، لەکۆتایشدا نەزانیت کەدەبیت چۆن چۆنی خۆشەویستی بکەیت.

"هەرگیز هیچ کەسێ بوونی خوا ناسەلمینێ. هەندێ شت لەژیاندا تەنیا دەبێ ئەزموون بکرین و بیستنی ئەزموونی خەلکانی تر لەبارەیانەوە بێ سوودە.

"ئەوین بابەتیکی واهیە، خواوەند - کەخودی ئەوینە - ئەویش وایە. باوەری ئەزموونیکی سەردەمانی منداڵییە، بەو جۆرە ئەفسونیکە کەعیسا دەفەرمویت: (عەرشی خواوەند هی منداڵانە ).

( خواوەند هەرگیز ناچیتە میشکی مرۆڤەوە، دەلاقەیەك کەئەو سوودی لی وەربگریت، دلی مرۆڤە ).

٥٤

لەنیو راهیبەکاندا وا بڵاوبوبووەوە کەجوزیفی راهیب هیندە خواپەرستی کردوە بەسەر تەواوی ئارەزوە دەروونیەکانیدا زاڵ بووەو چیدی پیویست ناکات نیگەرانی هیچ شتێ بیت.

ئەم قسانە گەیشتەوە گویی یەکێ لەداناکانی پەرستگەی سیتا. دانا پاش خواردنی عەسرانە قوتابیەکانی بانگهیشت کردو پیی گوتن: ( بیستوتانە جوزیف چیدی وەسوەسەی دەرونیی نییە کە پیویستبێ زاڵ ببیت بەسەریا، کەمی خەبات گیان (رۆح) لاواز دەکات. وەرن داوا لەخواوەند بکەین فیتنەیەکی گەورە بۆ جوزیف بنیریت، ئەگەر توانی لەبەرامبەر ئەو فیتنەیەدا راوەستێ، داوا لەخواوەند بکەین فیتنەو ئاشووبی تری بۆ بنیریت. وەرن بانزا بکەین کەکاتێ ئەو دووچاری ئاشووبیك بوو هەرگیز نەلیت: ( خودایە، شەیتانم لی دوورخەرەوە ) نزا بکەین لەجیاتی ئەوە بلیت: (پەروەردگارا ، هیزیکم پێ ببەخشە تابتوانم بەسەر ئەم شەرو ئاشووبەدا سەرکەوم ).

٥٥

لەهەر رۆژیکدا، ساتیك هەیە کە شتەکان بەروونی نابینرینو رۆشنبینی دژوارە: کاتی خۆرئاوا بوون. لەم ساتەدا رووناکیو تاریکی تیکەڵ دەبنو هەمووشتێ نەتەواو رۆشنەو نەتەواو تاریکە. لەزۆریك لەنەریتە مەعنەوییەکاندا، ئەم ساتە بەپیرۆز دەژمیردریت.

لەمەزهەبی کاسۆلیکدا پیمان دەگوتریت هەموو رۆژێ سەعات شەشی پاش نیوەرۆ نزای سلاو لەمەریەم[1] بخوینین.

لەقوتابخانەی (کوچوان)[2] دا، ئەگەر پاشی نیوەرۆ بچینە لای برادەریك و تاکاتی خۆرئاوابوون لەلای بمینینەوە، ئەوا دەبیت لەوە بەدواو بۆ هەمیشە سەلاموعەلەیك لەگەل ئەو کەسەدا بە(عەسرت بەخیر) دەست پێ بکەین.

لەتاریك و لیلدا، هاوسەنگی نیوان مرۆڤو ئەستیرە تاقی دەکریتەوە. خواوەند سیبەرو رووناکی تیکەڵ دەکات تابزانیت ئایا زەوی جورئەتی دریژەدان بەسورانی هەیە یان نا.

ئەگەر زەوی لەتاریکی نەترسێ، شەو تیدەپەریتو سبەی خۆریکی نوێ دەست بە درەوشانەوە دەکات.

---

[1]. Ave Maria
[2]. Quechuan

(شۆپنهاوەر)[١]ی فەیلەسوفی ئەلمانی، لەحالیکدا بەدوای وەڵامێ بۆ پرسیارە ئازاردەرەکانیدا ویل بوو، لەشەقامێ لە(دریسدن)[٢]دا دەگەرا. کاتێ بەتەنیشتی باغیکدا تیپەری، بریاریدا دابنیشێو تەماشای گوڵان بکات.

یەکێ لەخەلکەکەی ئەوێ رەفتاری سەیری فەیلەسوفی بینیو پۆلیسی ئاگادار کردەوە. چەند دەقیقەیەك دواتر، ئەفسەرێ لەشۆپنهاوەر نزیك بووەوە بێ ئەدەبانە پرسی:

( کییت ؟ )

شۆپنهاوەر لەسەرتاپای پۆلیسەکە ورد بووەو گوتی: ( ئەگەر بتوانیت یارمەتیم بدەیت وەڵامی ئەم پرسیارە بدۆزمەوە، بۆ هەمیشە سوپاسگوزارت دەبم ).

---

١. Schopenhauer
٢. Dresden

## ٥٧

پیاویك بۆ گەران  بەدوای خوادا، بریاریدا بروات بۆ کویستان، چونکە پییان گوتبوو خودا  هەر دوو ساڵ جاریك لەوێ دەردەکەویت. بەدریژایی سالی یەکەم، لەهەموو ئەو شتانەی کەزەوی خستبوویە بەردەستی خواردی.سەرئەنجام  ئازوقەکە تەواو بووو ناچار بوو بگەریتەوە بۆ شار.

کابرا هاواری کرد: "خوا بێ ویژدانە! ئەو تینەگەیشت من یەك ساڵ لەپیناوی بیستنی دەنگی ئەودا ئارامم گرت. من برسیم بووو ناچار بووم بگەریمەوە بۆ شار."

لەو ساتەدا فریشتەیەك دەرکەوت. فریشتەکە گوتی: "خوا زۆر حەز دەکات لەگەڵ تۆدا قسە بکات. ئەو سالیکی تەواو خۆراکی بەتۆدا و ئومیدەوار بوو کەلەوە بەدوا خۆت خواردنی خۆت ئامادە بکەیت. بەڵام تۆ چیت چاند؟ مرۆڤیك نەتوانیت لەو شوینەی کەدەژی بەرهەمێ پەروەردە بکات. هیشتا ماویەتی لەگەڵ خوادا قسە بکات."

خـەلکی دەلیـن: "وادیتـە بـەرچاو کـەئازادی بـۆ مـرۆڤ بەواتـە سەرپشك بـوون لەهـەلبژاردنی جۆرێ کۆیلەیـەتی. مـن رۆژی هەشـت سـەعات کـار دەکـەم، ئەگـەر تـەرفیع وەربگـرم دەبیـت رۆژی دوازدە سـەعات کـار بکـەم. مـن ژنم هینـاوەو ئیسـتا هیـچ کـاتیکم بۆخـۆم نییـە. مـن بـەدوای خـوادا گـەرامو ئیسـتا دەبیـت لـەکۆرە ئایینی‌یـەکاندا، لەمەراسـیمو سـەرجەمی تەشـریفاتەکاندا ئامـادە بم. هـەر شـتێ کـە لەژیاندا گرنگە - ئەویندارى كاروبـاوەر- سـەرئەنجام دەبیتـە بـاریکی قـورس بەسـەر شانی ئیمەوە."

پیر دەلیت: ((تەنیا ئەوین توانای هەلهاتنمان پیدەدات. تەنیا ئەوین، کۆیلەیەتی دەگۆریـت بـۆ ئـازادی. گـەر نـاتوانین خۆشەویسـتی بکـەین، واباشـترە دەسـتبەجێ رابوەستین. عیسا گوتویە: "باشتر وایە چاویکت کویر بیت، تائـەوەی هـەموو ئـازای ئەندامت لەتاریکیدا بفەوتیت". ئەمانە وشەگەلیکی قورسن، بەلام مانادارن.))

٥٩

پارسایەك سالیكی بە رۆژوگرتن بــردە ســەر، بــەجۆری كــە هەفتــەی تــەنیا یــەك جار نانی دەخوارد.

كــاتی وادەكــەی كۆتــایی هــات، پارســا داوای لــەخواوەند كــرد مانــای راســتەقینەی ئایەتێ لەئایەتەكانی ئینجیلی بۆ ئاشكرا بكات. بەڵام گویی لەهیچ وەڵامیك نەبوو.

پارسا بەخۆی گوت: "چ بیهودە تەمەنی بەنرخم بەفیرۆدا. مـن چـاوم لەهـەموو شتێ پۆشی، بەڵام خودا وەڵامیكی نەدامـەوە. باشـتر وایـە بـرۆمو پـیریك بدۆزمـەوە واتای ئەم ئایەتە بزانیت."

ئالەوسـاتەدا فریشــتەیەك دەركــەوتو گوتــی: "دوازدە مــانگ رۆژوگرتــن تــۆی هەلخــەلتاند، پیتوابــوو لەخــەلكی دی باشــتری. خواوەنــد هــەرگیز نــزای مرۆڤــی لەخۆبایی وەرناگری. بەڵام كەبی فیزیت نواندو داوای كۆمەكت لەخـەلكی تـر كـرد، خواوەند منی نارد."

فریشتەكە، ئەوەی پارساكە دەیوست فیری كرد.

مامۆستا دەلیت:

"سەیرکە چۆن وشـەلیکی دیـاریکراو بـەجۆریك پیکـهاتوون کـەمانای خۆیـان بەشیوەیەکی ئاشکرا نیشان دەدەن .

" بۆ نمونـە وشـەی لیکدراوی " پیـش سـەرقالی " لەبـەرچاو بگـرن کـە لەپیشـگری "پیـش" و نـاوی " سـەرقالی " پیکهاتووەو بـەمانای سـەرقالی میشـك بەشـتیکەوە کـە هیشتا روینەداوە، دەگەیەنیت.

"چ کەسیك لـەم جیهانـەدا دەتوانیـت بـەهەرەی سـەرقال بـوون بەشـتیکەوەی هـەبی کەهیشتا روینەداوە؟

"هیچ کاتی لەپیش رودانی رووداویکدا میشکی خۆتـان مەشغول مەکەن. ئاگاتـان لـە ریگەو چارەنوسی خۆتان بیت. هەرشتی کەپیویستە، فیری بـن، تـابتوانن ئـەو خەنجـەرە بریسکەدارە هـەلبگرن کەبەئەمانـەت لای ئیـوە دانـراوە. سـەرنج بدەنـە نـاکۆکی نیـوان دۆستان، مامۆستایانو دوژمنانتان.

"بەئەندازەی پیویست خۆتان پەروەردە بکەن، بەلام ئەو باوەرەی کە ( دەزانم چۆن چۆنی زەربەیەك لەدوژمنەکەمەوە دەخۆم ) خراپترین هەلەیە. دوچاری نەبن."

٦١

هەینی دیت، دەرۆیت بۆمالـەوەو رۆژنامەیـەك هـەلدەگری كەبـەدریژایی هەفتـە نـەتتوانیوە بیخوینیتـەوە. تەلەفزیۆنەكە دادەگیرسـینی و دەنگەكـەی كـز دەكـەیت. كاسـیتی دەخەیتـە سـەر ریكۆردەرەكـە. لـەحالیكدا كەهـەول دەدەیـت لاپـەرەی رۆژنامەكە هەلبدەیتـەوەو گـوی لەمۆسـیقا بگریـت، بەكۆنترۆلەكـە لـەم كەنالـەوە دەپـەری بـۆ ئـەو كـەنال. رۆژنامـە هیـچ شـتیكی تـازەی تیـا نـیـە، بەرنامـەكانی تەلەفزیۆن دوبارەن، كاسیتەكەیش دەیان جـار گویـت لیبـووە. ژنەكـەت مندالـەكانت دەشواتو وشكیان دەكاتەوە، بەبی ئەوەی بزانیـت بۆچـی سـالانی لاویتـی خـۆی ئـاوا بەخت كردوە. بیانوو بۆ خۆت دەهینیتەوە: "ئیتر ئاوایە ژیان."

"نا! ژیان ئەمە نییە. ژیان لیوانریژە لەحەزو خرۆش. بیربكەرەوە بزانە حـەزو تاسـەت لـەكوی گـوم كـردوە. پیـش ئـەوەی زۆر درەنـگ ببیـت، ژنو مندالـەكانت هەلبگرەو هەول بدە دوبارە حەز وتاسەت بدۆزیتەوە.

هیچ كاتی ئەوین كەسی لەگەران بەدوای خەونەكانیا نەگیراوەتەوە.

## ٦٣

لەشــەوی جــەژنی کریسمســدا، نوســەرو هاوســەرەکەی ســالی روو لـــەکۆتاییان هەلدەسەنگاند. بەدریژایی شیوان، لەتاکە چیشتخانەکەی گوندیکی پیرنـە، نوسـەر لەپەیوەند بــەو روداوەی کـە بـەو شـیوەیە چاوەروانی دەکـرد نـەچووبووە پیشـەوە، دەســتی کــردە گلــەییو گــازاندە. هاوســـەرەکەی لـــەو درەختـــی کریسمســـە رامـــا کەچیشتخانەکەی رازاندبووەوە. نوسـەر وەیزانـی ژنەکـەی حـەزی لـەم باسـە نـیـە، بۆیـە بابـەتیکی تـری هینایــە پیشــەوە. گوتــی: "ئــەو لامپانــەی بەدرەختەکــەوەن جوان نین؟"

هاوسەرەکەی وەلامی دایەوە: "با، چـۆن! بـەلام ئەگـەر بـەوردی تەماشـا بکـەیت، دەبینـی لـەنیوان دەیـان لامپـدا، یـەکیکیان سـوتاوە. بـەرای مـن لەپـەیوەند بەسـالی رابردوشەوە تۆ لەبری ئەوەی بیر لەدەیان بــەهرەی درەوشـاوە بکەیتــەوە، تـەنیا بـیر لەو لامپە سوتاوە دەکەیتەوە کە روناکی نییە."

٦٣

شەیتانیك بەهاوریکەی گوت: "سەیری ئەو پارسا بیفیزە بکە بەســەر جادەکـەدا دەروات. دەچم دەست بەسەر رۆحیدا دەگرم.

ئەوی تریان گوتی: "ئـەو گـوی لەقسـەت نـاگریت. ئـاخر ئـەو تـەنیا بـیر لەشـتە پیرۆزەکان دەکاتەوە."

بەلام شەیتان بەبی ئۆقرەییە هەمیشەییەکەی، خۆی خستە شیوەی جوبرەئیلی ئەمینو لەبەرامبەر کابرای پارسادا دەرکـەوتو گوتـی: "مـن بـە مەبەسـتی کۆمـەك کردنی تۆ هاتووم."

کابرای پارسا گوتی: "تۆ دەبیت منت لەگەل یەکیکی تر لی تیکچووبیـت. مـن لـە هەموو ژیانمدا کاریکم نەکردووە سـەرنجی فریشـتەیەك بـەلای خۆمـدا راکیشـم." و دریژەی بەریگەکەیدا، بەبی ئەوەی کەبزانیت لەگومرایی دوورکەوتۆتەوە.

## ٦٤

ژنی لەهاوریکانی نوسەر بۆسەیرکردنی نمایشی چوو بۆ برۆدوەی[١]. لە ماوەی نیوان دووپەردەدا، بۆ خواردنەوەی شتیك چووە دەرەوە. هۆلەکە قەرەبالغ بوو و خەلکی بەجگەرەکیشانو قسەکردن و خواردنەوەوە سەرقال بوون. پیانۆژەنیك پیانۆی دەژەنی، بەلام کەس گویی بۆ مۆسیقاکەی شل نەدەکرد. هاوریکەی نوسەر خواردنەوەکەی تەواو کردو پیانۆژەنەکەی خستەژیر چاوەدیریەوە. ماندوو دەهاتە بەرچاوو کارەکەی تەنیا وەکو ئەرکیك ئەنجام دەداو چاوەروانی کۆتایی هاتنی کاتی پشووەکە بوو. ژنە لەدوای هەلدانی خواردنەوەیەکی ترو بەدەست هینانی غیرەت، چووە لای پیانۆژەنەکەو بەدەنگی بەرز گوتی: "زۆر وەرزکەریو میشکی پیاو ورد دەکەیت. بۆچی بۆ دلی خۆت ناژەنیت؟"

پیانۆژەن سەرسام ماو دەستی کرد بەژەنینی ئەو ئاوازانەی حەزی لییان بوو. لەماوەی چەند دەقیقەیەکدا هۆلەکە بیدەنگ بوو. کاتی ئاهەنگەکە تەواو بوو، چەپلەیەکی بەجۆشیان بۆ لیدا.

---

[١]. Broadway

سانت فرانسیس ئاسیزی[١] کاتی لەبەرسەرقال بوون بەکاروباری ژیانەوە هەموو شتیکی خستە لاوە، پیاویکی گەنجی زۆر خۆشەویست بوو. سانت کلییەر[٢] کاتی بریاری عیفەتو پاکیزەییدا، ژنە لاویکی زۆر جوان بوو. سانت رەیمۆندۆ لول[٣] کەپیی نایە بیابانەوە شارەزای زۆریك لەزانستو زانیاریەکانی سەردەمەکەی خۆی بوو. خواست لەسەرو هەموو شتیکەوەیە. جۆریك بەربەرەکانی خوازی هەیە. کەسی کەبۆ هەلاتن لەکیشەو گرفتەکانی سوود لە عیرفان وەردەگری، ریگەیەکی دریژ ناروات. کەسی کەناتوانیت لەگەل خەلکانی تردا دەرگای دۆستی ئاوەلا بکات، ئاساییە لەدونیا دوورەپەریزی بکات. کاتی مرۆڤ نەتوانی دەرامەتیکی باش بەدەست بهینی، خیرو بیرکردن لەپیناوی هەژاریدا چ مانایەکی هەیە؟ ئەگەر کەسی ترسنۆك بیت، بی فیزی نواندن کاریکی پوچانەیە. راست ئەوەیە شتیکت هەبیتو چاوی لی بپۆشی. جیاوازە لەگەل ئەوەی هیچت نەبیتو گالتە بەخەلکیتر بکەیت. بۆپیاوی دەرون نزم کاریکی سانایە بەم لاو ئەولادا بروات تەبلیغی هەژارییەکی رەها بکات. بەلام سوودی چیە؟

پیر دەلیت: "لەکاری خواوەند رازیبە و وەك چۆن رووبەرووی دنیا دەبیتەوە ئاواش بەسەر دەرونتدا زال بە."

---

[١]. Saint Francis of Assisi
[٢]. Saint clare
[٣]. Saint Raimundo Lull

٦٦

رەق بـوون ئاسـانە. تـەنیا کـاریك کـەدەبێت ئـەنجامی بدەیـن ئەوەیـە کـە بـە خۆدوورگرتـن لەخـەلك لەئازارچێشـتن خۆمـان دووربخەینـەوە. بـەم جـۆرە چێـدی ناچار نین مەترسی ئەوین، نائومیدیو خەونە بێ هودەکان قبول بکەین.

رەق بوون ئاسانە. ناچار نین لەپیناو تەلەفۆنگەلیکدا کەدەبوو بمانکردنایە، یـان خـەلکیك کـەداوای یارمـەتیان لێ دەکردیـنو ئـەو خێروخێراتانـەی کـەدەبوو بمانکردنایە، نیگەران بین.

رەق بوون ئاسـانە. هێنـدە بەسـە واخۆمـان پیشـان بدەیـن کـە لـەبورجی عـاجدا دەژیـنو هـەرگیز دلۆپـە فرمیسـکی نـاریژین. بـەلام دەبیـت لـەو بـاقی تەمەنـەماندا رۆلی بگیرین.

رەق بوون ئاسانە. هێندە بەسە تـەواوی ئـەو شـتە باشـانە بخەینـەلاوە کـە ژیـان دەیخاتە ئیختیارمانەوە،،

نەخۆشی بەدکتۆرەکەی گـوت: "دکتـۆر مـن زۆر بـەتوندی لـەژێر کاریگـەری ترسدامو ترس هیچ خۆشییەکی بۆ نەهێشتومەتەوە."

دکتۆر گوتی: "لێرە، لەعەیادەکەم، مشکێك هەیە کتێبەکانم ئەجوی. ئەگەر مـن ئـەو مەسـەلەیە بەسـەختی وەربگـرم، ئـەوا خۆیـم لێدەشـارێتەوە منیـش جگـە لەهەولدان بۆ راوکردنی ئەو چ کاریکی تر ناکەم. بەلام بەپێچەوانـەوە، مـن هـەموو کتێبە باشەکانم لەجێیـەکی سـەلامەتدا دانـاوەو رێگـەم بەمشکەکە داوە دەسـتبەری بۆهەندی لەوانەی کە ماونەتەوە. بەم جۆرە مشکەکە وەك مشکی دەمێنێتەوەو بـۆم نابێتـە مێردەزمەیـەکی زەبـەلاح. لـە شـتگەلێکی کـەم بترسـەو هـەموو ترسـی خـۆت لەسـەر ئەوانــە کۆبکــەرەوە. بــەم شــێوەیە لەرووبەرووبوونــەوەی مەســەلەگەلێکی گرنگتردا، دەتوانی ئازایانە مامەلە بکەیت."

٦٨

پیر دەلی:

"زۆربەی جار خۆشویستنساناترە لەوەی ببیت بە خۆشویستراو.

"ئیمە قبول کردنی یارمەتیو پشتیوانی خەلکانی دیمان دژوار دیتە بەرچاو. بۆئەوەی خودکەفایانە دەربکەوین، هەولەکانمان بواری دەربرینی ئەوین بەخەلکانی دی نادەن.

"زۆریك لەدایکانو باوکان، لەتەمەنی پیریدا، رۆلەکانیان لەقەرەبووکردنەوەی ئەو خۆشەویستیو پشتیوانییە مەحروم دەکەن کەلە منالیدا پییان دراوە. زۆر ژنومیرد، لەکاتی غەمبارییاندا لەپشت بەستن بەوی تریان هەست بەشەرم دەکەن. لەئەنجامدا، ئاوی ئەوین ری ناکاتو بلاو نابیتەوە.

"تۆ دەبیت رەفتاری سۆزئامیزانەی خەلکانی دی قبول بکەیت. دەبیت ریگە بەکەسانی دی بدەیت یارمەتیت بدەن، هیزی پیشوەچوونت بدەنی.

"ئەگەر ئەوینیکی وا بەدلسۆزیو بی فیزییەوە قبول بکەیت، ئەوکات بۆت دەردەکەویت ئەوین نەدەبەخشریتو نەوەردەگیریت. ئەوین بوونە هاوبەشی یەکترییە."

حەوا لەباغی عەدەندا پیاسەی دەکرد، ئیبلیس لەشیوەی ماردا لیی نزیك بووەوەو گوتی: "ئەم سیوە بخۆ."

حەوا، هەر بەو جۆرەی کەخودا فەرمانی پی کردبوو، بەقسەی نەکرد.

مارەکە پیی داگرت: "ئەم سیوە بخۆ. پیویستە بۆ میردەکەت جوانترو دلبەرتر بیت."

حەوا گوتی: "پیویست ناکات. ئەو جگە لەمن کەسی تری نییە."

مار دایە قاقای پیکەنینو گوتی: "هەلبەتە هەیەتی."

لەبەرئەوەی حەوا باوەری بەقسەی مارەکە نەکرد، مارەکە حەوای بۆسەر گردۆلکەیەك برد کە کانییەکی لی بوو.

مارەکە گوتی: "ئەو لەخوارەوەیە. ئادەم ئەوی لیرەدا شاردۆتەوە."

حەوا سەیری خوارەوەی کردو ژنیکی جوانی لەئاوەکەدا بینی، ئەوجا ئەو سیوەی خوارد کەمارەکە دابوویە.

هەلبژاردەگەلی لە" نامەیەك بۆدلم":

" دلەکەم، من هەرگیز تۆ سەرزەنشت و سەرکۆنە ناکەم. لەوەی کەدەیلییت هەرگیز هەست بەشەرم ناکەم. دەزانم تۆ رۆلەی خۆشەویستی خودایتو ئەو تۆ لەپەنای پرشنگی ئەوینو جەلالی خۆیدا پەنا دەدات.

" دلەکەم.. من باوەرم بەتۆ هەیە. من لایەنگری تۆم و بەردەوام نزات بۆ دەکەم. دوعا دەکەم کە بگەیت بەو کۆمەكو پشتیوانییەی کەپیویستتە.

" دلەکەم، من باوەرم بەتۆ هەیە، لەسەر ئەو باوەرەم کە ئەوینی خۆت لەگەل هەرکەسیکدا کەپیویستی پییەتی یان شایستەیەتی بەش دەکەیت. باوەرم وایە ریگەی من ریگەی تۆیەو ئیمە پیکەوە بەرەو گیانی پیرۆز هەنگاو دەنیین.

" داوات لی دەکەم متمانەم پیبکەیت. بزانە کە خۆشم دەوییتو هەول دەدەم تەواوی ئەو ئازادییەت بتدەمی کەبۆ شادانە لیدان لەسنگمدا پیویستت پییەتی.

" هەر کاری پیویست بیت ئەنجامی دەدەم تاهەرگیزاو هەرگیز لە بوونی من لەچوار دەورتدا هەست بەدلتەنگی نەکەیت.

٧١

پیر دەلیت:

" کاتی بریار دەدەین دەست بۆکاریك ببەین، ئاساییە دەرگیریگەلیکی نەویستراو بینە پیشی. ئاساییە لەم دەرگیرییانە برینگەلیکمان ویکەوی. برینەکان چاك دەبنەوە، بەلام شوینەواریان دەمینیتەوە، ئەمەش خۆی بەهرەیەکە شوینەواری برینەکە تاکۆتایی تەمەن لەگەلمان دەمینیتەوە، ئەمە کۆمەکیکی گەورەیە بۆ ئیمە. ئەگەر سەردەمانیك، بەهەر هۆیەك بی، ئارەزوی گەرانەوە بۆ رابردوو لەئیمەدا بەهیزبیتەوە، ئەوەندە بەسە تەماشای شوینەواری برینەکانمان بکەین. شوینەواری برین، جیگەی کۆتو زنجیرنو دەمانخەنەوە یادی ترسی زیندانو بەم وەبیرهینانەوەیە، دووبارە بۆپیشەوە دەرۆین."

## ٧٣

سانت پـاول[1] لەنامەیـەکیدا پیمـان دەلیـت هیـوری یەکیکـە لەتایبەتمەندییـە سەرەکی‌یەکانی ئەوین.

وەرن باهـەرگیز لـەیادی نەکـەین کـە ئـەوین یـانی ناسـکی، گیـانی سـەخت ریگـە بەدەسـتانی خـودا نـادات بیتوینیتـەوەو بەوشـیوەیەی جیگـەی خواسـتی خۆیـەتی دروستی بکاتەوە.

نوسەر لەشـەقامیکی بـاریکی بـاکوری ئیسـپانیادا گەشـتی دەکـرد پیـاویکی بینـی لەسەر پیخەفێ لـەگوڵو گولـزار راکشابوو. لیـی پرسـی: "پیـت وانی‌یـە بـەم کـارەت گولەکان دەپلیشینیتەوە؟"

کابرا وەڵامی دایەوە: "نەخیر. تـەنیا هـەوڵ دەدەم تۆزقالێ لەناسـکیەکەیان بـۆ خۆم هەلبگرم."

---

[1]. Saint Paul

٧٣

پیر دەلیت:

" هەموو رۆژی دوعا بکە، تەنانەت ئەگەر دوعاکانت نارۆشنیش بن، لە دوعاکانتدا داوای هیچ شتیکیش نەکەیت. خۆت لەسەر دوعا کردن رابینە، خۆئەگەر ئەم کارە لەسەرەتادا دژوارە، ئەوا بەلین بەخۆت بدە: ( من ئەم هەفتەیە، هەموو رۆژی دوعا دەکەم.)و لەکۆتایی هەفتەدا، ئەم بەلینە بۆ حەوت رۆژی تر تازە بکەرەوە.

" بیرت نەچی بەم کارە، نەك هەر تەنها پەیوەندییەکی توندو تۆل لەگەل جیهانی مانادا دادەمەزرینی، بەلکو لەسەر راهینانی ئیرادەیش رادییت. لەریی راهینانگەلیکی واییەوەیە کە لەشەری ژیاندا دیسپلینی پیویست لەخۆماندا دروست دەکەین.

" سوودی نابیت گەر یەك رۆژ بەلینەکەت فەرامۆش بکەیتو رۆژی دواتر دوبارە دوعا بکەیتەوە. یان ئەوەی یەك رۆژ حەوت جار دوعا بکەیتو لەشەش رۆژەکەی تردا دوعا نەکەیتو پیت وابیت ئەرکی خۆت ئەنجام داوە.

" هەندی شت دەبیت بەهەنگاوی هاوئاهەنگو نەزمیکی راستو دروست جیبەجی بکرین."

خراپەکاریك، لەکاتی مردندا فریشتەی دەرگاوانی دۆزەخی بینی.

فریشتە گوتی: "هیندە بەسە کەتەنیا یەك کاری چاکت کردبێ تاهەر ئەو کارە رزگارت بکات. باش بیر بکەرەوە."

کابرا بیری کەوتەوە جاریکیان لەدارستانیکدا پیاسەی دەکرد، لەسەر ریگەکەیدا جالجالۆکەیەکی بینیبوو، جا بۆ ئەوەی پێ بەجالجالۆکەدا نەنیت، لەریگەکەی خۆی لایدابوو.

فریشتە زەردەیەکی کردو لەم کاتەدا تالی لەتەونی جالجالۆکەیەك لەئاسمان هاتە خوارەوەو ریگەی بەکابرادا سەربکەویت بۆ بەهەشت. باقی حوکمدراوەکانی تریش سوودیان لەتەونەکە وەرگرتو دەستیان کرد بەسەرکەوتن بەرەو سەرەوە. بەلام کابرا لەترسی پچرانی تەونەکە گەرایەوەو پالی بەوانەوەنا بۆ خوارەوە، لەهەمان ساتدا تەونەکە پچراو کابرا دووبارە گەرایەوە بۆ دۆزەخ. ئەو کات کابرا گویی لیبوو فریشتەکە دەلیت: "شەرمهینەرە. خۆپەرستییەکەت ئەو تاکە چاکەیەشتی کرد بە خراپە."

٧٥

پیر دەلیت:

"دووریان جیگەیەکی پیرۆزە. لەویدایە کەدەبیت زیارەتکەر بریاری خۆی بدات. هەر لەبەرئەوەیە خواکان لەدووریانەکاندا دەخۆنو دەخەون.

"جیگەیەك کەدوو ریگە بەیەکەوە ببەستێ، دوو هیزی مەزن تیایدا کۆدەبیتەوە؛ ریگەیەك هەلدەبژیردریتو ریگەیەك لەبەرچاو ناگیریت. دوو ریگە تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت دەبن بەتاکە ریگەیەك.

"رەنگە زیارەتکەر لەویدا پشوو بدات، سەرخەوێ بشکینێو تەنانەت پرسو راویژیش بەخودایانی نیشتەجێی دووریانەکە بکات، بەلام هیچ کەسێ ناتوانیت هەتاهەتایە لەویا بمینیتەوە. کاتێ بریار درا، ئەو دەبیت بەبێ بیرکردنەوە لەو ریگایەی کەخستویەتیە لاوە دریژە بە ریگاکەی بدات. جگە لەمە، دووریانەکە دەبیتە چەرمەسەری.

مرۆڤایەتی، بەناوی راستی‌یەوە ژمارەیەك لەدرندانەترین تاوانەكانی خۆی ئەنجام داوە. پیاوو ژنگەلیك لەخەرمانی ئاگردا سوتاون. كەلتوری هەندی لەشارستانیەتەكان بەتەواوی فەوتاوە. ئەوانەی كەگوناهی خواردنی گۆشتیان ئەنجامدا دوور خرانەوە. ئەوانی بەدوی ریگەیەكی تر كەوتن، بەگشتی لەمافە مەدەنییەكان بیبەری كران.

مرۆڤیك، بەناوی راستی‌یەوە چوارمیخەی كیشرا. بەلام لەپیش مردنیدا، پیناسەیەكی هەمەلایەنەی بۆ راستی بەجی هیشت. راستی شتیك نییە دلنیایی بەئیمە ببەخشیت. شتیك نییە ئیمە والی بكات لە خەلكی رەشۆك باشتر بین. شتیك نییە كە لەزیندانی بیروباوەری دواكەوتووانەدا بەحەپسی بمینیتەوە. راستی ئەو شتەیە كە ئیمە دەگەیەنیت بەئازادی.

ئەو گوتی: "راستی بناسە. ئەوكات راستی تۆ ئازاد دەكات."

٧٧

یەکی لەراهیبەکانی پەرستگەی سیتا گوناهیکی گەورەی کرد، برایـان بـۆ داوەری کردن داوای ئاقلترین راهیبیان کـرد. راهیبـە ئاقلەکـە بـەم کـارە رازی نـەبوو، بـەلام کاتی پیداگری هەمووانی بینی، سەرئەنجام رازی بوو.

راهیبی هۆشمەند بەرلەوەی بکەویتـە ری، دۆلکەیـەکی هـەلگرتو بنەکـەی کـون کرد. پاشان دۆلکەکەی پرکرد لەوردە زیخو بـەرەو پەرسـتگەکە کەوتـەری. گـەورەی رۆحانیان دۆلکەکەی بینی؟ لەمانای ئەم کارەی پرسی.

راهب گوتـی: " مـن بـۆ داوەری کـردن لەسـەر کەسـیکی تـر هـاتووم. گونـاه لەسـەروروم دەبـاری، وەك چـۆن وردە زیـخ لـەم دۆلکەیـە دیتـە خـواری. بـەلام مـن لەبەرئەوەی تەنیا سەیری بەرامبەرەکەم دەکەمو گوناهەکانی خۆم نـابینم، دەتـوانم لەسەر کەسیکی تر داوەری بکەم.

بەبیسـتنی ئـەم قسـانە، راهیبـەکان بریاریـاندا، بـی سـیو دوو لیپرسینەوەکە رابگرن.

٧٨

لەسەر دیواری کلیسایەکی بچوك لەپیرنە نووسراوە:

"پەروەردگارا، بائەم مۆمەی کەئیستا دامگیرساند، بدرەوشیتەوە.

لەکاتیکیشدا کەدوچاری کیشەیەکمو عەزمی بریاریکم هەیە،

روناکم بکاتەوە

بائاگریك هەلبگیرسینێ.

کەبتوانی بەهۆیەوە خۆپەرستیو غرورو ریابازی من بسوتینێ.

باگریکی لی هەلسێ

کەبتوانی بەهۆیەوە گەرمی بەدلم ببەخشێو فیری خۆشەویستیم بکەیت.

من ناتوانم ماوەیەکی زۆر لیرە بمینمەوە.

بەلام بەدانانی ئەم مۆمە، گەردیك لەبوونی من لیرە دەمینیتەوە

یارمەتیم بدە کارەکانی ئەمرۆم عیبادەت بن.

ئامین.

٧٩

یەکێ لەهاوڕیکانی نوسەر بڕیاریدا چەند  هەفتەیەك لەیەکێ لەپەرستگەکانی نیپاڵ بەسەر بەرێ. ڕۆژێ پاش نیوەڕۆ چووە ناو یەکێ لەپەرستگە زۆرو زەوەندەکانی دیرەوەو راهیبیکی بینی کە زەردەخەنە لەسەر لیو لەمیحرابدا دانیشت بوو.

ئەو پرسی: "بۆچی پیدەکەنیت؟"

راهیب گوتی: "چونکە لەمانای مۆز تێ دەگەم." ئەوکات کیسەکەی کردەوەو مۆزیکی گەنیوی دەرهیناو گوتی: "ئەمە ئەو ژیانە روو لەکۆتاییەیە کە ماوەکەی بەسەرچووەو سوودیکی لێ وەرنەگیراوە. ئیستاش زۆر درەنگ بووە." پاشان مۆزیکیتری لەکیسەکە دەرهینا کەهیشتا سەوز  بوو. ئەو مۆزەی پیشانی کابراداو دووبارە خستیەوە نیو کیسەکەیەوە و گوتی: "ئەمە ئەو  ژیانەیە کەهیشتا سەرەی نەهاتووەو چاوەڕوانی کاتی گونجاوە." دواجار مۆزیکی گەییوی دەرهینا، پاکی کردو لەگەڵ کابرادا نیوە بەشیان کردو گوتی: "ئەمە ساتەوەختی ئیستایە. فیربە چۆن بەبێترس تیایدا بژیت."

ژنیك، ریك بری ئەو پارەیەی هەلگرت کەپیویستی بوو کورەکەی پیّ بەریت  بـۆ سینەما، لەمالْ چوو بووە دەرەوە. کوریژگە خرۆشا بوو تاوناتاویّ لـەدایکی دەپرسـی کەی دەگەنە ئەویّ.

کاتـیّ لەپشـت چـرای سـووریترافیکلایتەکەوە وەسـتـا بـوو، سـوالکەریکی بینـی لەقەراغ شۆستەکە دانیشتووە. گویی لەدەنگیّ  بـوو دەیگـوت: "هـەموو ئـەو پارانـەی پیتە بیدە بەو"

ژنە لەگەلْ دەنگەکەدا کەوتە قسەوباس، ئەو بەلینی بەکورەکەی دابوو کـەبیبات بۆ سینەما.

دەنگەکە پیّی داگرت: "هەموو پارەکەی بدەری."

ئـەو گوتـی: "دەتـوانم نیـوەی پارەکـەی بدەمـیّو کورەکـەم بەتـەنیا بنـیرم بـۆ سینەماو خۆشم لەدەرەوە چاوەروانی بم."

دەنگەکە نەیویست لەم بارەیەوە یەكو دوو بکات: "هەموو پارەکەی بدەریّ"

ژنە کاتی نەبوو بۆ کورەکەی رون بکاتەوە. ئوتومبیلەکەی راگرتو  پارەکـەی بـۆ گەداکە راگرت.

سوالکەرەکە گوتی: "ئیوە بۆ منتان سەلماند کەخودا هەیە. ئەمرۆ رۆژی  لـەدایك بوونمە. مـن لەسـوالکردن نارەحـەتو شـەرمەزار بـووم. لەبەرئـەوە بریـارم دا سـوالْ نەکەم. گوتم ئەگەر خوایەك هەبیت، خۆی دیارییەکم پیشکەش دەکات.

## ٨١

پیاویك لەژیر باراندا، بـەگوندیکی چکۆلـەدا تیدەپـەری. مـالیکی بینـی دەسـوتاو پیاویکی بینی لە ژوری دانیشتن لەناوەراستی ئاگرەکەدا دانیشتووە.

گەشتیار هاواری کرد: "هیی، مالەکەت ئاگری گرتووە!"

کابرا وەلامی دایەوە:"دەزانم."

گەشتیار گوتی: "ئەی بۆ نایەیتە دەرێ؟"

کابرا گوتی: "ئاخر لەدەرەوەش بـاران دەبـارێ. دایکـم هەمیشـە دەیگـوت ئەگـەر بەباران برۆیتە دەرەوە، توشی کۆکە دەبیت."

زائوچی[1] لەبارەی ئەم چیرۆکەوە دەلیت: "ئاقلْ ئەو کەسەیە وەختێ ناچار بـوو، بتوانیت شوینەکەی بەجیبهیلیت."

[1]. Zao chi

## ٨٣

لەهەندێ لەسونەتەکانی جادوگەریدا، قوتابیان رۆژیکی ساڵ - یان ئەگەر پیویست بیت دواین رۆژی هەفتەیەك- رۆژیك بۆ پیاسە کردن بەنیو کەلوپەلەکانی مالدا تەرخان دەکەن. ئەوان دەست لەهەموو شتەکان دەدەنو بەدەنگی بەرز دەپرسن: "بەراست من پیویستم بەمە هەیە؟" کتیبەکان لەسەر رەفەکان هەلدەگرنو دەلین: "ئایا من جاریکیتر ئەم کتیبە دەخوینمەوە؟"و هەر یادگارییەك کە هەلیانگرتوە بەرزی دەکەنەوە و دەپرسن: "ئایا هیشتاش ئەو ساتەم بەلاوە گرنگە کەئەم شتە دەمخاتەوە یادی؟" دەرگای گەنجەکان دەکەنەوەو دەلین: "چەندیکە ئەمەم نەپۆشیوە؟ ئایا بەراستی پیویستم پییەتی؟"

پیر دەلیت: "شتەکان وزەی تایبەتی خۆیان هەیە. کاتێ سوودیك ناگەیەنن، دەبنە ئاویکی راوەستاو لەنیو مالدا: جیگەی گونجاو بۆ زەلکاوو میشولە. دەبیت وریا بیتو ریگا بدەیت وزە ئازادانە وەگەر بکەوێ. ئەگەر کەلوپەلی کۆنە هەلگری، ئەوا کەلوپەلە تازەکان بۆ نمایش کردنی خۆیان جیگەیان دەست ناکەویت."

## ٨٣

حەكایەتیكی كۆنی پیرۆیی، چیرۆكی شاریك دەگێریتەوە كەهەموو خەلكەكەی شاد دەژیان، هەر كاریكیان حەز لیێبووایە دەیانكردو پیكەوە بەباشی دەسازان. بیجگە لەفەرمانرەواكە كەغەمگین بوو، ئەویش لەبەرئەوەی شتیك نەبوو فەرمانرەوایەتی بەسەردا بكات. زیندان خالی بوو. هیچ كاتێ دادگا بەكار نەهاتبوو و لەدیوانی دادنووسدا هیچ بەلگەنامەیەك نەدەنوسرا، لەبەرئەوەی قسەی مرۆڤ زیادتر لەو پەرە كاغەزانەی ئەو قسانەیان لەسەر تۆمار دەكرا، نرخیان هەبوو.

رۆژیك فەرمانرەوا چەند كریكاریكی لەناوچەیەكی دوورە دەستەوە بانگهیشت كرد تا لەناوەراستی مەیدانی سەرەكی شاردا سەكۆیەك دروست بكەن. هەفتەیەك دە نگی چەكوشو مشار دەبیسترا.

لەكۆتاییدا فەرمانرەوا هەموو خەلكی بۆ ئاهەنگی پەردەلادان بانگهیشت كرد. بەهەیبەتیكی تەواوەوە لەهەر چوار لای سەكۆیەكەوە پەردە خزیە خوارێ. لەوێ سیدارەیەك دەبینرا.

خەلكی لەیەكتریان دەپرسی سیدارە لەوێ چی دەكات. ئەوان بەترسو دلەراوكیوە بۆ لابردنی ناكۆكیگەلی كەپیشتر بەدانوستانی دوولایەنە چارە دەكرا بۆ دادگا رۆشتن. چوون بۆ دیوانی دادنووس تا ئەو بەلگەنامانە تۆمار بكەن كەپیشتر تەنیا بەشیوەی قسەی شەخسی بوون. هەروەها لەترسی یاسا دەستیان كرد بەگویگرتن لەقسەكانی فەرمانرەوا. ئەم ئەفسانەیە دەلیت هیچ كاتێ سیدارەدارەكە كەلكی لیوەرنەگیرا، بەلام بوونی ئەو هەموو شتیكی گۆری.

۸٤

پیر دەلیت:

"لەم ساتە بەدواوەو بۆ ماوەی چەند سالی، جیهان بەئاراستەی گۆشەگیرکردنی کەسانیکدا دەرواتــە پیشەوە کەبیرو بۆچوونی رزیویان هەیە. وزەی زەوی دەبیت تازە ببیتەوە. ئەندیشە تازەکان پیویستیان بەشوین هەیە. جەستەو رۆح خەباتی نوییان دەوێ. ئایندە لەدەرگا دەداتو هەموو ئەندیشەکان، جگە لەوانەی کەچنگ لەدەمارگیری توند دەکەن، بواری دەرکەوتن بەدەست دەهینن.

"ئەوەی گرنگە دەمینیتەوەو ئەوەشی بێ سوودە مەحو دەبیتەوەو نامینێ. بەلام ریگەبدە هەرکەس داوەری بیروڕای خۆی بکات. ئیمە دادوەری خەونەکانی خەلکانیتر نین.

"بۆ باوەربوون بەو ریگەیەی کە گرتومانەتە بەر، پیویست بەسەلماندنی عەیباری ریگەیەکیتر ناکات. کەسیك کەوا دەکات، باوەری بەریگەکەی خۆشی نییە."

## ٨٥

ژیان لەپێشبڕکییەکی گەورەی پاسکیل سواری دەچێت کەئامانج لێی ژیانە لەسەر بنچینەی ئەفسانەی شەخسی.

لەهێلی دەست پێکردن دا، هەموو بەیەکەوەین و هاورییەتی و شۆڕو شەوقمان لەگەڵ یەکدا بەش دەکەین. بەڵام بەبەرەو پێشچوونی پێشبڕکێکە، شادمانییەکەی یەکەم جار جێگەی خۆی بەکێبەرکێ کردنەکە دەدات: ماندوێتی، یەك ڕیتمیی و متمانە بەخۆ نەکردن. دەبینین هەندێ هاورێ خۆیان لەهەوڵ و کێبڕکییەکە دەبوێرن. هێشتا لەپێشبڕکێدان تەنیا لەبەرئەوەی کەناتوانن ئەم کارە لەنێوەیدا واز لێبینن. ئەم جۆرە خەلکانە زۆرن. ئەوانە لەقەراغی ئۆتۆمبێلی تەداروکاتەکەدا پایدەر لێدەدەن و لەگەڵ یەکدا قسە دەکەن و درێژە بەکارەکەیان دەدەن.

ئێمە خۆمان لەحالیدا دەبینینەوە کەپێشیان دەکەوین؛ پاشان ناچارین ڕووبەڕووی تەنیایی بینەوە. لۆفەو پێچە نامۆکان و کێشەکانی پاسکیلەکە گێژمان دەکات. دواجار لەخۆمان دەپرسین کەئایا ئەم کۆششە، بەهایەکی هەیە؟

بەڵێ، بەهای هەیە. دەست لەکۆشش هەڵمەگرە.

٨٦

پـیرو موریـدێ لـەبیابانی عەرەبسـتاندا بەئەسـپ غاریـان دەدا. پـیر سـوودی لەهەموو ساتەوەختێکی گەشتەکە وەردەگـرت تـا وانـەی بـاوەر فـێری قوتابییەکـەی بکات. دەیگوت: "پشت بەخوا ببەستە. ئەو هەرگیز بەندەکانی خۆی بەرەڵا ناکات."

شـەو لەجێیـەکدا هـەواریان خسـتو پـیر داوای لەموریدەکــەی کــرد ئەسـپەکان بەبەردیکەوە ببەستێتەوە.

مورید بەرەو لای تاویرەبەردیک رۆشـت. بـەڵام ئـەوەی پیرەکـەی فـێری کردبـوو بـیری کەوتـەوە. بـەخۆی گـوت: "پـیر خەریکـە مـن تـاقی دەکاتـەوە. مـن دەبێـت ئەسـپەکان بـەخودا بسـپێرم." پاشـان بـەبێ ئـەوەی ئەسـپەکان ببەسـتێتەوە، بەئەمانەتی خوا بەرەڵای کردن.

سپێدە، مورید ئەسپەکانی نەبینی. شپرزەو تێکچوو هاتەلای پیرو سکاڵای کـرد: "تۆ سەبارەت بەخوا هیچ نـازانی. مـن ئەسـپەکانم بـەخودا سـپارد، بـەڵام ئێسـتاکە دەبینم ئاژەلەکان رۆیشتوون."

پـیر گوتـی: "خـوا دەیویست چاوەدێری ئەسـپەکان بێـت، بــەڵام بـۆ ئـەم کـارە پێویستی بەدەستەکانی تۆ هەبوو تا ئەسپەکان ببەستێتەوە."

٨٧

جۆن گوتی: "دوور نییه عیسا بەمەبەستی رزگار کردنی گیانەکان ژمارەیەك لەحەوارییەکانی بۆ دۆزەخ نەناردبیت. تەنانەت لەدۆزەخیشدا هەموو شتێ کۆتایی نەهاتووە."

ئەم بۆچوونە نوسەری سەرسام کرد. جۆن کارمەندی ئاگر کوژانەوەیەو ئەو رۆژە رۆژی پشووی بوو.

نووسەر پرسی: "بۆچی ئەم قسانە دەکەیت؟"

جۆن گوتی: "چونکە من هەر لیرە، لەسەر زەوی، رۆشتوومەتە دۆزەخەوە. دەچمە ناو خانوو و بیناگەلیکی گرگرتووەوەو خەلکانیك دەبینم کەئومیدی رزگار بونیان لەدەست داوەو چەندجار بۆ رزگارکردنی ئەوانە گیانی خۆم خستۆتە مەترسی‌یەوە. من لەم جیهانە گەورەیەدا، گەردیلەیەکم کە لەزۆریك لەشەرەکانم لەگەڵ ئاگردا ناچار بووم وەکو کەسیکی قارەمان رەفتار بکەم. ئەگەر من — هیچیك — بتوانم ئاوا بکەم، بینە بەرچاوی خۆت عیسا چی ناتوانیت بکات. من گومانم نییە ژمارەیەك لەحەوارییەکانی عیسا چونەتە ناو دۆزەخەوەو لەوێ خەریکی رزگارکردنی گیانەکانن.

پیر دەلیت:

(هەندیك لەكۆمەلگە سەرەتاییەكان نەریتیان وابوو مردوەكانیان بەشیوەی گرمۆلە (جنین)یی بنیژن. ئەوان دەیانگوت: (مردوو دوبارە پی دەنیتە ژیانیكی نویوە و ئیمە دەبیت بەهەمان حالەتەوە كەپیێ نایە ئەم دنیایەوە بینیژین."

لەو كۆمەلگانەدا مردن تەنها هەنگاویكیتربوو لەریگەی پیوانی دنیادا.

"كەمە كەمە، جیهان قبولٚ كردنی لەسەرخۆیی مردنی لەدەست دا. بەلاٚم بایەخیكی نییە ئیمە چۆن چۆنی بیردەكەینەوە، چی دەكەینو باوەرمان بەچی هەیە. هەمووومان رۆژیك دەمرین."

(باشتر وایە وەكو یۆگاییە هندییەكان بكەین: مردن بكەینە راویژكاری خۆمان. بەردەوام بپرسین: "لەبەرئەوەی دەبیت رۆژێ بمرم، دەبیت لەئیستادا چی بكەم؟")

ژیان پەنددادانو پەندوەرگرتن نییە. ئەگەر پیویستمان بەهاوکاری هەیە، باشتر وایە بزانین کەسانی دی چۆن چۆنی توانیویانە - یان نەیانتوانیوە - گیروگرفتەکانیان چارەسەر بکەن.

فریشتەی ئیمە هەمیشە ئامادەیەو بۆ گەیاندنی مەسەلەیەك بەئیمە لەلیوی کەسیکی دی کەلك وەردەگری. قسەکانی ئەو بەشیوەیەکی تەواو ئاسایی‌و زۆربەی جار ریك لەساتیکدا دەیبیستین کەسەرباری ئاگالیبوون و سەرقالییەکانمان، ناهیلن موعجیزەکانی ژیان ببینین.

ئیمە دەبیت ریگە بەفریشتەکەمان بدەین هەر کاتیّ خۆی بەگونجاوی بینی‌و بە باشترین شیوە کەخۆی دەیزانیت، قسەمان لەگەلدا بکات.

پیر دەلیت: "پەند، تیۆرەیەکە لەمەر ژیان - راستی ژیان، زۆر جیاوازە."

باوکیك لەئەندامانی بزوتنەوەی ژیاندنەوەی مەسیح لەریودوژانیرۆ[1]سواری ئوتوبوس بوو، گویی لەدەنگێ بوو داوای لی دەکرد لەهەمان ساتەوەختدا هەستیتو بانگەشە بۆ قسەکانی مەسیح بکات. باوکە کەوتە مشتو مر لەگەڵ دەنگەکەدا: "ئەوانە پییان وایە من مرۆیەکی گالتەجارم. ئیرە شوینی وەعز و وتاردان نییە." بەلام دەنگەکە پییداگرت کەهەر دەبیت قسە بکات. باوکە پارایەوە: "من پیاویکی شەرمنم. تکایە داوای ئەمە لەمن مەکە." بەلام هیزە دەرونیەکە هەروا پیی‌داگرت.

لەوکاتەدا بەلینەکەی خۆی بیرکەوتەوە؛ ئەوەی کەتەواوی نەخشەکانی مەسیح بگریتە ئەستۆ. هەستاو بەپەشۆکاوییەوە لەبارەی مەسیحەوە دەستی کرد بەقسە کردن. گەشتیارەکان بەبیدەنگی گوییان بۆ هەلخست. چاوی برییە تاکە تاکی گەشتیارەکانو هەموویان راستەوخۆ سەیری ئەویان دەکرد. هەموو ئەو شتانەی هەستی پێ دەکرد گوتنیو وەعزەکەی کۆتایی پیهیناو لەجیگەکەی خۆیدا دانیشتەوە.

ئەو باوکە تائەمرۆش نازانیت ئەو رۆژە، لەئوتوبوسدا چ ئەرکیکی بەئەنجام گەیاندووە. بەلام هیچ گومانی نییە کەئەو رۆژە، مەئمورییەتیکی ئەنجامداوە.

---

[1]. Rio de janiro

جادوگەریکی ئەفریقی، لەدارستانیکدا، قوتابیە تازە دەست بەکارەکەی رینوینی دەکرد. جادوگەر هەرچەندە تەمەنی زۆر بوو، بەخیرایی بەریدا دەرۆشت، لەحالیکدا لاوەکە یەك لەسەر یەك دەخلیسکاو دەکەوت. لاوە هەلدەستایەوە، جوینی دەدا، تفی دەکردە زەوی‌و بەدوای پیرەکەیدا بەریدەکەوتەوە. لەپاش بەپێ رۆشتنیکی دوورو دریژ، گەشتنە شوینیکی پیرۆز. جادوگەر بێ ماتڵ بوون دەستی کرد بەگەرانەوە بۆ ئەو شوینەی کەلییەوە رۆشتنەکەیان دەست پیکرد بوو.

لاوە کەوت، لەحالیکدا کەهەلدەستایەوە گوتی: "ئەمرۆ هیچت فیر نەکردم."

جادوگەر گوتی: "من ئەمرۆ دەمویست شتیکت فیربکەم، بەلاّم تۆ نەتتوانی فیری بیت. دەمویست فیرت بکەم لەژیاندا چۆن چۆنی رووبەرووی هەلەکانت ببیتەوە."

لاوە پرسی: "دەبیت چۆن چۆنی رووبەروویان ببمەوە؟"

جادوگەر وەلاّمی دایەوە: "هەر بەو جۆرەی کەدەبوو لەگەڵ کەوتنەکانتدا مامەلەت بکردایە. لەبری نەفرەت کردنی ئەو جیگەیەی لیی کەوتبووی، دەبوو بگەرایتایەو دەرتخستایە کەچ شتیك بۆتە هۆی خزین‌و کەوتنەکانت.

٩٣

راهیبێ چوو بۆ دیداری باوکە گەورەی پەرستگەی سیتا.

راهیب گوتی: "پیرەکەی من نازانیت رینوینیم بکات. ئایا دەبیت وازی لێ بینم؟"

باوکە گەورە قسەیەکی نەکردو راهیبەکە گەرایەوە بۆ بیابان.

یەك هەفتە دوای ئەوە راهیبەکە سەرلەنوێ بۆلای باوکە گەورەی پەرستگە گەرایەوەو گوتی: "پیرەکەم نازانیت رینوینیم بکات منیش بریارم داوە وازی لێ بینم."

باوکە گەورەی پەرستگە گوتی: "کاریکی ئاقلانەیە. کاتێ مرۆڤ بۆی دەردەکەویت کەگیانی نارازیە، ناتوانیت پەند وەربگریت. بۆ دریژەدان بەجولەت لەژیاندا، ئەو بریارانەی پیویستن، بیاندە."

## ٩٣

ژنیکی گەنج بۆ بینینی نوسەر هاتو گوتی: "دەمەوێ مەسەلەیەکت لەگەلدا باسی بکەم. من هەمیشە بروام وابووە کەلە بەهرەی شیفا بەخشیندا بەهرەمەندم، بەڵام هەرگیز جورئەتم نەبووە لەسەر کەسێ تاقی بکەمەوە. تائەوەی رۆژیکیان میردەکەم لەپیی چەپیدا هەستی بەئازاریکی زۆر کردو کەسیش لەبەردەستا نەبوو کۆمەکی بکات. من بەشەرمنییەوە بریارمدا دەستم بخەمە سەر پیی ئەو و داوابکەم ئازارەکە نەهیلم. من بەبێ ئەوەی باوەرم بەمە هەبیت کەدەتوانم یارمەتی ئەوبدەم، ئەم کارەم کرد کاتێ وام کرد گویم لی بوو میردەکەم دوعا دەکات: (پەروەردگارا، بهیلە هاوسەرەکەم بەسەر پەیامهینی روناهیو تواناتدا توانادار بیت.) دەستم، دەستی کرد بەگەرم بوونو ئازارەکە نەما. دواتر لەوم پرسی کەبۆچی بەو جۆرە دوعای کرد. ئەو وەڵامی دایەوە بۆ ئەوەی متمانە بەخۆمم بداتێ. ئەمرۆ من بەهۆی مەرحەمەتی ئەو وشانەوە توانام هەیە شیفا ببەخشم."

٩٤

ئاریستیپوسی[1] فەیلەسوف، سەر مەست لەتواناى خۆى لەبارەگاى دیونیسوس[2] فەرمانرەواى سەرکوتگەرى سیراکۆس، رۆژێ چاوى کەوت بە دیوژانس[3] کە شۆرباى نیسکى لەبەردەمیدا دانابوو.

ئاریستیپوس گوتى: "ئەگەر خزمەتى دیونیسوست بکردایە، ناچار نەبووى نسکین بخۆیت."

دیوژانس گوتى: "ئەگەر دەتزانى چۆن چۆنى بەنسکین خواردن رازى بیت، ناچار نەبووى کرنوش بەرى بۆ دیونیسوس."

پیر دەلیت: "راستە هەر شتەو نرخیکى هەیە، بەلام هەمیشە نرخ ریژەییە. کاتێ بەدواى خەونو ئامانجەکانماندا دەکەوین، رەنگە کەسانى دى پییان وابیت کەناشادو مایەى بەزەیى بین. بەلام ئەوەى کەسانى دى بیرى لى دەکەنەوە گرنگ نییە. ئەوەى گرنگە ئەوهەست بەخۆشى کردنەیە کەلەناو دلدا هەستى پیدەکەین."

---

1. Aristipus
2. Dionysus
3. Diogenes

هەواڵیان دابە پیاویکی تورك، کە لەئیران پیریکی گەورە دەژی. کابرا بێ کات بەفیڕۆدان هەرچی بوو فرۆشتی، ماڵئاوایی لەخیزانەکەی کردو بەدوای ئەقلدا کەوتەرێ.

پاشی چەند ساڵ سەرگەردانی، سەرئەنجام گەیشتە بەردەم دەرگای سەرا چکۆلەکەی کابرای گەورە و بەترس‌و ریزەوە لەدەرگایدا.

پیری گەورە دەرگای کردەوە.

کابرا گوتی: "من خەلکی تورکیام. ئەم هەموو ریگایەم بریوە تاپرسیاریکت لی بکەم."

پیر، سەرسورماوانە گوتی: "زۆر باشە، دەتوانیت بپرسی."

کابرا گوتی: "دەمەویت لە پرسیارەکەمدا ورد بم. ئایا دەتوانم پرسیارەکەم بەتورکی بلیم؟"

پیاوە هۆشمەندە گوتی: "بەلێ، ئیستا وەلامم دایتەوە. ئەگەر شتیکیتر هەیە کەدەتەویت بزانیت، لەدلت بپرسە، دلت وەلامت دەداتەوە."

ودەرگاکەی داخست.

پیر دەلیت:

"وشە، توانایە. وشە جیهان دەگۆریت، هەر بەو شیوەیەی کەپیاویش دەگۆرێ. هەمووومان بیستوومانە کەدەلین: "باسی ئەو روداوە باشانە نەکەین بەسەرماندا هاتووە نەبادا ئیرەیی کەسانی دی خۆشیو شادمانیەکانمان لی تیك بدەن."

"قەت وانیيە. ئەوانەی سەرکەوتوون، لەخۆباییانە باسی موعجیزەکانی ژیانیان دەکەن. ئەگەر وزەیەکی ئیجابی لەبۆشاییدا بەرەلا بکەیت، ئەو وزەیە، وزەگەلیکی ئیجابی زیاتر کیش دەکات و لییانەوە کەسانیك دینیتە ئاراوە کەشادمانی تۆیان دەوی.

"حەسوودانو شکستخواردوان تەنیا لەیەك حالەتدا دەتوانن زیانت پێ بگەیەنن، ئەویش کەخۆت توانای ئەو کارەیان پێ بدەیت.

"مەترسە. لەگەلٚ هەر کەسیکیدا کەئامادەیە؛ لەمەر روداوە باشەکانی ژیانت بدوی. گیانی بوون پیویستیەکی زۆری بەشادمانی تۆ هەیە."

٩٧

پاشـايەك لەپاشـاكانى ئيسـپانيا زۆر شـانازى بەرەچەلـەكى خۆيـەوە دەكـردو لەرادەبـەدەر سـتەمى لـەبێ دەسـەلاَتان دەكـرد. رۆژێ لەگـەل كۆمـەلێ لـە دەسـتو پيوەندە بەرجەستەكانى لەبيابانيكدا پياسەى دەكرد، كەسالاَنيك لەوەو پيش باوكى لەشەريكدا تيايدا شكستى خواردبوو. گەشتنە پارسايەك كە گردۆلكەيـەكى گـەورەى لەئيسقان سەرو ژير دەكرد.

پاشا پرسى: "لەويا چى دەكەيت؟"

پارسا گوتى: "شەوكەتى سولتان بەردەوام بيت. كاتێ بيسـتم كەپاشـاى ئيسـپانيا ديـت بـۆ ئـيرە، بريـارم دا ئيسـكەكانى باوكتـان بدۆزمـەوەو بيدەمـەوە بەبـەريزتان. بەلاَم هەرچى هەولَ دەدەم نـاتوانم بيـان دۆزمـەوە. چـوون ئيسـكەكانى ئـەو لەگـەلَ ئيسكى جوتياران، هەژاران، كۆيلەو گەداياندا جياوازييەكى نييە."

٩٨

شەركەریك لەمامۆستاكەی پرسی: "باشترین شمشیروەشین كییە؟"

مامۆستا گوتی: "بچۆ بۆلای دەشتەكەی نزیكی پەرستگە. تاویرەبەردیكی لییە. دەمەویت سوكایەتی بەو تاویرەبەردە بكەیت."

قوتابی پرسی: "بۆچی دەبیت ئاوها بكەم؟ ئاخر بەردەكە وەلام ناداتەوە."

مامۆستا گوتی: "زۆرباشە، بەشمشیرەكەتەوە هەلمەتی بۆ بەرە."

قوتابی گوتی: "ئەمەش ناكەم. شمشیرەكەم دەشكێ. خۆ ئەگەر بەدەستانم پەلاماری بدەم، بەبێ ئەوەی شوینەوارێ لەسەر ئەو بەجێ بهیلم، پەنجەكانم بریندار دەكەم. بەلام من ئەمەم نەپرسی. من گوتم باشترین شمشیر وەشینە كییە؟"

مامۆستا گوتی: "چاكترین كەس ئەوەیە وەكو ئەو گابەردەیە. بێ شمشیر راكیشان دەیسەلمینیت هیچ كەس ناتوانیت بەسەریا سەر بكەویت."

# ٩٩

نوسەر گەیشتە گوندی سان مارتین دوئونکس[1] لەناڤارا[2] و ئەو ژنەی دۆزییەوە کەکلیلی کلیسا ویرانەکەی رۆمی لەلابوو. ژنە بەمیهرەبانیەوە بەپلیکانەیەکی باریکدا سەرکەوتە سەرێ و دەرگاکەی کردەوە.

تاریکیو بێ دەنگی خانووە چاخناوەراستیەکە، کاریگەرییەکی راچلکینەرانەی لەسەرنوسەر دانا. نوسەر لەگەڵ ژنە کەوتە قسەو لەنیو قسەکانیدا گوتی هەرچەندە نیوەرۆیە بەلام ناتوانریت بەرهەمە هونەرییەکانی کلیسا بەباشی ببینرین.

ژنە وەلامی دایەوە: "وردەکاریەکان تەنیا لەکاتی خۆرهەلاتن دا دەبینرین. وادەگیرنەوە کەوەستاکانی ئەم بینایە بەم کارەیان ویستوویانە کە بلین خواوەند کاتیکی تایبەتی بۆ نمایش کردنی گەورەیی خۆی داناوە."

---

1. San Martin de unx
2. Navarra

پير دەليت:

"دوو خـودا هەيـە: خودايـەك كەمامۆسـتايانمان فيريـان كردويـن، خودايــەكيش كەئيمــە فـيـر دەكـات؛ خودايــەك كەخــەلكى هەميشــە لەبارەيــەوە قســەدەكەن‌و خودايـەكيش كەقســەمان لەگــەلٚ دەكـات؛ خودايــەك كــەفيركراوين ليـى بترسـين، خودايەكيش كەلەبارەى خۆشەويستيەوە لەگەلماندا دەدوێ.

"دوو خـودا هەيـــە: خودايـــەك كەلـــەو ســـەرەيەو خودايـــەكيش كەلـــەژيانى رۆژانەماندا بەشدارە؛ خودايەك كەسزامان دەدات خودايەكيش كەكەم‌وكوريـەكانمان دەبەخشـيت؛ خودايــەك كەبــەئاگرى دۆزەخ هەرەشــەمان لى دەكـات، خودايــەكيش كەباشترين ريگامان پيشان دەدات.

"دوو خـودا هەيـە: خودايـەك كەلـەژير بــارى گوناهــەكانماندا وردمــان دەكــات، خودايەكيش كەبەئەوينى خۆى رزگارمان دەكات."

١٠١

ڕۆژێك لەمایكڵ ئەنجیلۆ[1]یان پرسی چۆن دەتوانێت بەرهەمێكی واجوان دروست بكات. پەیكەرساز وەڵامی دایەوە: "زۆر سادەیە. كاتێ تەماشای پارچە مەرمەرێك دەكەم، پەیكەرێك لەناویدا دەبینم. تەنیا كارێك كەدەبێ بیكەم ئەوەیە ئەو شتانەی پەیوەندی بەپەیكەرەكەوە نیە لایبەمو دووری خەمەوە."

پیر دەڵێت:

هەریەك لەئێمە بۆ ئەفراندنی كارێكی هونەری دەستنیشانكراوە. ئەمە خاڵی سەرەكی ژیانی ئێمەیەو هەرچەندێك هەوڵ بدەین خۆمان فریو بدەین، دەزانین كەئەو كارە چەندە لەشادمانی ئێمەدا كاریگەرە. زۆربەی كات ئەو كارە هونەرییە لەژێرەوەی ساڵانێ لەترسو هەست بەگوناهو بێ بڕیاریدا شاردراوەتەوە. بەڵام ئەگەر بڕیار لەسەر نەهێشتن ولابردنی ئەو شتانە بدەین كەپەیوەندییان بەكارە هونەرییەكەوە نییەو هەروەها گومانمان لەلێوەشاوەییەكانی خۆمان نەبێت، ئەوا دەتوانین لەكارێكدا كەئەفسانەی تایبەتی ئێمەیە پێش بكەوین، ئەمەش تاقە ڕێگای ژیانی سەرفرازانەیە.

---

[1]. Michel Angelo

پـيره مـيردێ لەسـەر جيگـەی مـردن، لاويكـی بـانگكردە لای سـەرينەكەيەوە تاچيرۆكيكی حەماسی بۆ بخوينيتەوە: ئەو پيرەميردە لەرۆژگاری جەنگدا، يارمـەتی پياويكی دابوو لەمردن رزگاری ببيت. پەنای پياوەی دابوو خـواردنو ئەمنيـەتی بـۆ دابين كردبوو. كاتێ كابرا لەمەترسی رزگار بوو، برياريدا كەرزگاركەرەكەی تەسـليم بەدوژمن بكات.

لاوە پرسی: "چۆن توانيت هەلبييت؟"

پـيرە گوتـی: "مـن هەلنـەهاتم. مـن ئـەو پيـاوە خائنـە بـووم، بـەلام بـەم شـيوە گيرانەوەيەی چيرۆكەكە؛ وەك ئەوەی مـن ئـەو جوامـيرە بـووبم، دەتـوانم لەهـەموو ئەو كارانە تيبگەم كەئەو بۆ منی كرد."

پیر دەلیت:

"هـەمووومان پیویسـتمان بەئەوینـە. ئـەوین هینـدەی خـواردن، خواردنـەوەو خـەوتن بەشـیکە لەسروشـتی مـرۆڤ. هـەندێ جـار لەتـەنیاییدا تەماشـای خۆرئـاوابوونی جـوان دەكـەینو بیردەكەینـەوە: (ئـەم جوانیـە چ بایـەخیکی هەیـە، لەكاتیكدا كەسێ نییە لەگەڵماندا سەیری بكات.

"لـەم كاتانـەدا دەبیـت لـەخۆمان بپرسـین چـەند جـار كەسـیك داوای ئـەوینی لەئیمە كردوەو ئیمە رومان وەرگیراوە؟ تائیستا چەندجار ترساوین لەكەسێ نزیـك ببینەوەو بەدلنیاییەوە پیی بلیین كەخۆشمان دەویت؟

"لەتـەنیایی دووربكـەوەرەوە. تـەنیایی وەكـو خوگرتـن بەترسـناكترین مـادەی بیهۆشـكەر وایـە. ئەگـەر خۆرئـاوابوون چیـدی مانایـەكی بـۆت نییـە، شـوین ئـەوین بكەوە، بشزانە هەر وەكو ئەو بەهرە مەعنەوییانەیتر، هـەرچی بەخشـندەتر بیـت، زیاتر بەهرەمەند دەبیت."

مژده بەخشیکی مەسیحی ئیسپانی سەردانی دوورگەیەکی دەکرد، بەسێ پارسـای ئازتیکی[1] گەیشت.

باوکە پرسی: "چۆن چۆنی خوا پەرستی دەکەن؟"

یەکێ لەئازتیکەکان وەڵامی دایەوە: "ئیمە تەنیا یـەك دوعامـان هەیـە. دەڵیـین: خودایا، تۆ سیانیتو ئیمەش سیان. رەحممان پیبکە[2]."

مژدە بەخشەکە گوتی: "من دوعایەکتان فیردەکەم کەخودا گویی لی رادەگـرێ." پاشان دوعایەکی کاسـۆلیکیانەی فـیرکردنو دریـژەی بەریگەکـەیدا. ماوەیـەکی کـەم لەپیش گەرانەوەیدا بۆ ئیسپانیا، دووبارە لەهەمان دوورگەدا بارگەی خست.

کاتـێ کەشـتیەکەی لەکـەنار نزیـك بـووەوە، بینـی سـێ پارسـاکە بەسـەر روی ئاوەکەدا هەنگاو دەنینو لیی نزیك دەبنەوە.

یەکیك لەوان گوتی: "باوکە، دوبارە ئەو دوعایەمان فیربکەرەوە کەخوا گویی لی دەگریت، ئیمە ئەو دوعایەمان لەبیر چۆتەوە."

قەشـە بـەبینینی کـەراماتی ئـەوان گوتـی: "زۆر گرنـگ نییـە." داوای لیبوردنـی لەخواوەند کرد، چونکە نەیدەزانی کەخواوەند بەهەموو زمانەکان قسە دەکات.

---

[1]. Aztec

2 .ئامارژەیە بە سیکۆچکەی مەسیحیەت_ م.

سانت جۆن[1] فیرمان دەکات کەلە ریبازی مەعنەوی خۆماندا نابیت چاوەروانی ئیلهام بین، یان ئەوەی باوەرمان بەکارسازبوونی بۆچوونی کەسانیکی دی ببی کەهەمان ریگە دەبرن، تاقە پشتیوانی ئیمە دەبیت باوەرەکەمان بیت، لەبەرئەوەی روونەو لەدەرونی ئیمەدا بەئەمانەت دانراوە. ناتوانریت لەگەڵ شتیکی‌تردا لیمان تیك بچیّ.

نوسەرو قەشەیەك پیکەوە سەرقالی قسەوباس بوون. نوسەر لەقەشەی پرسی کەئەزمونی خودا لەچی دەچیت. قەشە وەڵامی دایەوە: "نازانم. تاکە ئەزمونیك کەتائیستا هەمبووە، ئەزموونی باوەرداریم بووە بەخودا."

ئەمەش لەهەموویان گرنگترە.

[1]. Saint john of the cross

١٠٦

پیر دەلیت:

" رابــردو شــەقامیکی دووســایدە. هــەر کــاتیك لەکەســی دەبوریــن، خۆشمـــان دەبەخشین. ئەگەر لەبەرامبەر کەسانی دیدا بەئارام بین، قبول کردنــی گوناهــەکانی خۆمان سادەتر دەبیت. بەم ریگەیە دەتوانین بەدوور لە هەلە و سەرزەنشــت، ژیــانی خۆمان چاك بکەین.

" کاتی بەهۆی لاوازیەوە، ریگــەی نــەفرەتو ئــیرەیی‌و دەمارگیری دەدەیــن چــوار دەورمان بگرن. پاش کەمیکی‌تر خۆمان لەدیلیتی ئەوانەدا دەبینینەوە.

" پەترۆس لەمەسیحی پرسی: ( گەورەم، رەوایە حەوت جار لەکەسی ببورین؟)

" مەسیح وەلامی دایەوە: ( نەك حەوت جار، بەلکو هەفتا جار.) "

کردەی لیبووردن، زاتی بالا پاکژ دەکاتەوەو رونــاهی راســتەقینەی خودایــەتیمان بۆ دەردەخات."

١٠٧

پیر دەلیت:

" پیرو مشایەخانی کۆن نەریتیان بوو، بۆ کۆمەك کردن بەرووبەرووبوونەوەی قوتابییەکانیان لەگەل بەشە تاریکەکانی کەسایەتییاندا، دەست بەرن بۆ دروست کردنی دەموچاوگەلیك. زۆریك لەو چیرۆکانەی پەیوەستن بەو کەسایەتیانەوە بوونەتە ئەفسانەگەلیکی بەناوبانگ.

" پرۆسەی دروست کردنی چیرۆکگەلیکی ئاوا زۆر سادەیە: هیندە بەسە شیواوی وترس و نائومیدییەکانت بدەیتە پال ئەو کەسە نەبینراوەی کەلای چەپتەوە دەوەستی، ئەو رۆلی مرۆڤیکی شەرانگیز دەگیری تۆهان دەدات بۆ کارگەلیك کەنابیت بیانکەیت، بەداخەوە دەشیانکەیت.

" کاتی کەسایەتییەکی ئاوا دروست بوو، وەلامنەدانەوەی هاندانەکانی ئەو ئاسانتر دەبیت.

" زۆر سادەیە. هەرلەبەر ئەمەیشە کە ئەمەندە کاریگەری هەیە."

موریدی لەپیرەکەی پرسی: " چۆن چۆنی دەتوانم باشترین ریگەی هەلس‌و کەوت کردن لەژیاندا بناسمەوە؟"

پیر داوای لەمورید کرد میزی دروست بکات. کاتی کەکاری میزەکە وەخت بوو بەکۆتایی دەگەیشت‌و تەنیا پیویست بوو بزمارەکانی روی میزەکە دابکوتریت، پیر هاتە لای مورید.

مورید هەر بزمارەی بەسی لیدانی ریکوپیک دادەکوتا. یەکی لەبزمارەکان بەد قەلەقی کردو موریـد ناچار بوو لیدانیکی‌تری پیدا بکیشی. لیدانی چوارەم بزمارەکەی لەرادەبەدەر بەتەختەکەدا بردە خواری‌و تەختەکە قلیشا.

پیر گوتی: " دەستت بەسی لیدان راهاتبوو. هەر کاریك ببیتە خوو، مانای خۆی لەدەست دەداو رەنگە بەزیانکاری تەواو ببیت.

" هەموو کاریك، کاری تۆیە، بەلام رازیك هەیە: هەرگیز ریگە مەدە راهاتن فەرمانرەوایی بە سەر کردەوەکانتەوە بکات."

## ١٠٩

نزیــك شــاری ســۆریا[1] لــه ئیســپانیا، كونجیكــی تــەریك لــەنیو گابــەردەكاندا هەلكەنراوە. چەند سالی پیش ئیستا پیاویك كەهەمموو شتیكی خستبووە لاوە تاخۆی بۆ بیركردنەوە تەرخان بكات، لەویا دەژیا.

پاش نیوەرۆیەكی پاییز، نوسەر بەدوای ئەو شوینەدا دەگەرا، كاتی ئەو شوینەی دۆزییەوە، راهب بەئامیزی والاوە پیشوازی لیكرد. لەپاش ئەوەی كەپیكەوە هەندەك نانیان خوارد، راهب داوای لەنوسەر كرد بۆ كۆكردنەوەی قارچكی خواردن لەگەلی بروات بۆ نزیك جۆگەیەكی بچوك كە لەو ناوەدا بوو.

هەر ئەوەندەی بەریكەوتن، كوریك لییان نزیك بووەوە. كورە گوتی: " پیاوی پیرۆز: پییان گوتووم بۆ بەدەستهینانی دەرون روناكی، دەبیت خۆم لەخواردنی گۆشت بەدوور بگرم. ئایا ئەمە راستە؟"

راهیب گوتی: " هەرشتیك ژیان بەتۆی دەبەخشیت بەچیژەوە وەریبگرە. دژبە گیانت گوناه مەكە، بەلام بی حورمەتی بەدەستو دل فراوانی زەویش مەكە."

---

[1]. Soria

پیر دەڵێت:

" ئەگەر گەشتەکەت دژوارە، گوێ بۆ دڵت رادێرە. هەوڵ بدە تـا دەتوانـی لەگـەڵ خۆتـدا راسـتگۆ بیـتو سـەیرکە بزانـە کـەئایا بەراسـتی و بەدروسـتی سـەرقاڵی شوێنکەوتنی ڕێگاکەت و دانی نرخی خەونەکانتی، یان نا؟

" ئەگەر ئاوهات دەکردو هێشتاش ژیانت هەر دژوار بوو، ئەوا ساتی دێتە پێشی کـەدەبێت سـکاڵا بکـەیت. لەگـەڵ ئـەوەدا، بـەرێزەوە سـکاڵا بکـە، هـەروەك منداڵێـك کـەلای بـاوکی سـکاڵا دەکـات. بـەڵام لـە داواکردنـی ئاوڵێدانـەوەو یارمـەتی دەسـتمەگیرەوە. خواوەنـد بـاوكو دایکـە. دایکـانو باوکـانیش باشـترین شـتیان بـۆ رۆڵەکانیان دەوێت. رەنگە رەوەندی فێرکردن دژوار ببێت، بەڵام داواکردنی وەستان و برێك نەوازش بەهایەکی نی‌یە.

" بەڵام زیادە رۆیی مەکە. ئـەیوب لـەکاتێکی گونجـاودا زمـانی گلـەیی هەڵـهێناو تەواوی سەروەتو سامانەکەی بۆ گەرێنرایـەوە. ئـالافید زۆرگلـەیی کـرد و خواوەنـد چیدی گوێی بۆ قسەکانی هەڵنەخست.

١١١

پیاویکی باوەردار، بەشێوەیەکی کتوپڕ هەموو سامانەکەی لەدەست دا. لەبەرئەوەی دەیزانی خواوەند بەجۆریك لەجۆرەکان کۆمەکی دەکات، دەستی کرد بە دوعا کردن: " پەروەردگارا! بهیلە لەتاقی کردنەوەی بەخت دا سەرکەوتووبم." چەندان سال دوعای کرد، بەلام هەروا هەژار مایەوە. سەرئەنجام رۆژیك مرد، لەبەر ئەوەی ئالەو کاتەدا زۆر باوەردار بوو، بی راوەستان یەکسەر برا بۆ بەهەشت.

کاتی گەیشتە ئەوی، لەچوونە ژورەوە سەرپیچی کرد. ئەو گوتی هەموو تەمەنی بەپیی ریوشوینە ئاینیەکانی ژیاوە، بەلام خودا قەت ریگەی نەداوە لە پیشبرکیی تاقی کردنەوەی بەختدا سەرکەوتووبیت. بەوەرسیەوە گوتی: " هەر بەلینیکت بەمن دابوو، درۆ بوو."

خواوەند وەلامی دایەوە: " من هەمیشە بۆ یارمەتی دانی تۆ ئامادە بووم. بەلام ویرای ئەوەی کە دەمویست یارمەتیت بدەم، تۆ تەنانەت یەك بلیتی یانسیبیشت نەکری."

چینییەکی بەسالا چووی ئاقل بەدەشتیکی پڕ لەبەفرا بەریدا دەڕۆیشت، بەژنیك گەیشت دەگریا. پرسی: بۆچی دەگریت؟"

ژنە گووتی: " بۆ ئەوە کەبیر لەژیانم دەکەمەوە، لەلاویتیم، لەو روخسارە جوانەی کەلەئاوینەدا دەمبینیو پیاوانیك کەخۆشم ویستوون. خودا زالمە، چونکە توانای بەبیرهینانەوەی بەخەلکی داوە. ئەو دەیزانی کەمن بەهاری ژیانم بەبیردینمەوەو فرمیسك دەریژم."

کابرای هۆشمەند وەستا، چاوی بریە خالیکی دوور و بەبیرکردنەوەدا قول رۆچوو. ژنە ساتی دواتر وازی لەگریان هیناو پرسی: " لەوی چی دەبینی؟"

کابرای هۆشمەند وەلامی دایەوە: " دەشتیکی پر لەگولی سوور. خودا لەهەقی مندا سەخی بووە کەتوانای بیرهینانەوەی پیبەخشیوم. ئەو دەیزانی کە من لەزستاندا هەمیشە دەتوانم بەهار بەبیر بهینمەوەو پیبکەنم."

١١٣

پیر دەڵیت:

" ئەفسانەی شەخسیی مرۆڤ رەنگە بەو سادەییە نەبێت کەدیتە بەرچاو. بەهیچ شیوەیەك. تەنانەت لەوانەیە پیویستی بەئەنجامدانی چەندان کاری ترسناك بیت. کاتی بریار لەسەر شتی دەدەین، وزەگەلیکی بەهیز بەگەر دەخەین و چیدی ناتوانین مانای واقیعی ژیان لەخۆمان بشارینەوە. کاتی بریاری شتی دەدەین، ئیختیاریك دەکەین و نرخەکەی دەدەین.

" بەدوادا چوونی خەون و ئامانجەکانمان نرخی خۆیان هەیە. دەشیت ناچارمان بکات واز لە خوو نەریتە کۆنەکان بینین، دەشیت مەسەلەگەلیکمان بۆ دروست بکات، رەنگە بشبیتە مایەی نائومیدی.

" بەلام نرخ هەر چەندیکیش بەرز بیت، هیندەی نرخی ژیان لەسەر بنچینەی ئەفسانەی شەخسی بەرز نییە. لەبەرئەوەی رۆژی دەروانینە رابردومان و ئەو کارانەی ئەنجامان داوەو دەنگی دلی خۆمان گوی لی دەبیت، کە دەلیت":(تەمەنی خۆم بەفیرۆدا."

" باوەربکە، ئەمە خراپترین شتە کە لەوانەیە گویت لیی بیت."

## ١١٤

پیریك سەدان قوتـابی هـەبوو. هـەر هـەموویان بـەردەوام لـەکاتی خۆیـدا ئەرکـە ئایینییەکانیان بەجی دەهینا، جگە لە دانەیەکیان کەهەمیشە مەست بوو.

رۆژی پـیر لەسـەرەمەرگدا، قوتابیـە هەمیشـە مەسـتەکەی بـانگ کـردو هـەموو نهینییە شاراوەکانی پی گوت.

قوتابیـەکانیتر هـەلچونو گوتیـان: " شـەرمەزارییە، ئیمـە هـەموو شـتەکانمان فیدای پیری کرد کە لەپەی بردن بەتواناییەکانمان بی توانابوو."

پـیر گوتـی: " مـن دەبـوو نهینییـەکان بەکەسـی بسـپیرم کـە بەباشـی بیناسـم. ئەوانـەی پیاوچاك دینـە بـەرچاو، زۆربـەی کـات خۆپەرسـتیو غـرورو دەمارگـیری خۆیـان دەشـارنەوە. لەبەرئـەوە مـن تەنـها ئـەو قوتابیـەم هـەلبژارد کەبەباشـی دەمتوانی کەمو کورتیەکەی ببینم: هەمیشە مەستەکە."

١١٥

باوکە مارکۆس گارسیا[1] گوتویە: " هەندی جار، بۆ ئەوەی باشتر قەدری بەهرەیەك بزانین، خواوەند بەهرەکەمان لی دەسەنیتەوە. خواوەند دەزانی کەتا چ ئاستی دەتوانریت گیان لەژیر تاقی کردنەوەدا رابگیریتو هەرگیز ئەولاتر ناروات.
" لەم کاتانەدا هەرگیز نابیت بگوتریت: ( خواوەند بەجیی هیشتووم.) ئەگەر خواوەند تاقیمان دەکاتەوە، بەهرەگەلیکیش بەئەندازەی پیویست، رەنگە لەپیویست زیاتریش، بۆ سەربلندی لەتاقی کردنەوەکەدا دەخاتە ئیختیارمانەوە.
" کاتی هەست بەدووری ئەو دەکەین. دەبیت لەخۆمان بپرسین: ( ئایا دەزانین چۆن چۆنی کەلك لەو شتانە وەربگرین کەئەو لەسەر ریگەی ئیمەدا دایناون؟)"

---

[1]. Marcos Garcia

١١٦

هەندێ جار چەندین رۆژو هەفتە تیدەپەریتو رەفتاریکی محبەتئامیزانە لەکەسی نابینین. قۆناغی ئاوا دژوارە؛ وادیتە بەرچاو کەسۆزو میحبەت لە نیوان مرۆڤەکاندا بارگەو بنەی خۆی پیچاوەتەوەو ژیان بۆتە زیندوومانەوەو بەس.

پیر دەلیت:

" دەبیت سەیریکی ئاگردانەکەی خۆمان بکەین، دەبیت داری زۆرتری تیبخەین و هەول بدەین کەسەرای تاریکی ژیانی خۆمان روناك بکەینەوە. کاتی دەنگی هەلبەزینەوەی داروچیلکەمان لەئاگردا بیستو ئەو چیرۆکەمان خویندەوە کەگرەکان دەیگیرنەوە، سەر لەنوی ئومیدمان بۆ دەگەریتەوە.

" ئەگەر توانای خۆشەویستی کردنمان هەبیت، دەشتوانین ببینە خۆشویستراویش. تەنیا بریك کات پیویستە."

کەسیك لەکاتی نانی نیـوەرۆدا، پەرداخەکەی شکاند. کەسیکی دی گوتی ئەمە نیشانەی بەختو نگینە."

هەموو ئەو کەسانەی لەسەرمیزەکە بوون ئەم باوەرەیان بیست بوو.

بەلام حاخامی کەلەوی بوو پرسی: " بۆچی ئەمە نیشانەی بەختە؟"

هاوسەری نوسەر گوتی: " نازانم رەنگە ئەمە نەریتیکی دیرین بیت تاکو میوان لەئەنجامی ئەو کارەی کردویەتی زۆر هەست بەنارەحەتی نەکات."

حاخام گوتی: " نەخیر، ئەوە نیە. هەندی لەدەستەو گروپە جولەکەکان باوەریان وایە هەر مرۆڤەو بەشیکی دیاریکراوی لەبەخت هەیە کەلەدریژەی ژیانیدا سەرفی دەکات. مرۆڤ دەتوانیت ئاگادار بیت بەختەکە تەنیا لە کاتگەلیکدا بەکار بهینی کەپیویستی پییەتی یان ئەوەی پیش بەوە بگریت دەست بلاوی لە بەکارهینانی بەشەکەی خۆیدا بکات."

" ئیمەی جولەکەش هەرکاتی کەسی شوشەیەك دەشکینی دەلیین: ( خۆش بەخت بیت.) بەلام ئەمە بەو مانایەیە: (باش بوو کەبەختەکەت بۆ بەرگرتن لەشکاندنی شوشەیەك سەرف نەکرد. ئیستا دەتوانی لەشتی گرنگتردا سەرفی بکەیت.)"

## ١١٨

باوكە ئەبراهام دەیزانی كە لەنزیك پەرستگەی سیتادا، راهیبیك دەژی كە بەهۆشمەندی ناوبانگی دەركردووە. بەدوای كابرادا رۆشتو لیی پرسی: " ئەگەر ئەمرۆ ژنیكی جوان لەنوینەكەتدا ببینی، ئایا دەتوانیت قەناعەت بە خۆت بینی كەئەوە، ژن نییە؟"

كابرای هۆشمەند وەلامی دایەوە: " نەخیر، بەلام دەتوانم خۆم كۆنترۆل بكەم."

باوكە دریژەی پیدا: " ئەی ئەگەر لەبیاباندا بریك دراوی زیر بدۆزیتەوە، دەتوانیت وافەرز بكەیت كەئەوانە بەردن؟"

هۆشمەند گوتی: " نەخیر، بەلام دەتوانم خۆم كۆنترۆل بكەمو لەهەمان شویندا بەجییان بهیلم."

باوكە پییداگرت: " ئەی باشە ئەگەر دووبرا كەیەكیكیان خۆشی دەوییتو ئەویتریان رقی لیتە، هەراكەیان هینایە لای تۆ، ئایا دەتوانیت وای دابنییت كەئەو دوانە لەگەل یەك یەكسانن؟"

راهیب وەلامی دایەوە: " ویرای ئەوەی لەناخەوە ئازار دەكیشم، بەلام لەگەل ئەوەیان كەرقی لیم بووە چۆن رەفتار دەكەم ئاواش رەفتار لەگەل ئەوەدا دەكەم كەخۆشیویستووم."

باوكە دواتر بەقوتابییەكانی گوت: " باپیتان بلیم هۆشمەند كییە. هۆشمەند ئەوەیە لەجیاتی ئەوەی ئارەزووەكانی بكوژیت كۆنترۆلیان دەكات."

١١٩

و. فراسیر[1] بەدریژایی هەموو ژیانی لەمەر خۆرئاوا شتی نوسیو کەیفخۆش بوو لەوەی فیلمنامەیەکی نوسیوە کە گری کوپەر رۆلی تیدا گیراوە. ئەو گوتوویە بەدریژایی هەموو ژیانی تەنیا لەساتەوەختگەلیکی کەمدا تورە بووە.

ئەو گوتویە: "من شتگەلیکی زۆر لەپیشینانەوە فیربووم. ئەوان لەگەڵ سوور پیستەکاندا شەریان کرد. بیابانەکانیان بری و بەدوای نانو ئاودا شوینگەلی دوورەدەست گەران. سەرجەمی نوسینەکانی ئەو قۆناغە، تایبەتمەندییەکی سەیر لەخۆ پیشان دەدەن: پیشینان تەنیا لەبارەی شتە باشەکانەوە قسەیان دەکردو دەیاننوسی. لەجیاتی گلەیی کردن، گۆرانیو نوکتەیان لەبارەی چەرمە سەریەکانیانەوە دروست دەکردو بەم شیوەیە لەترس دووردەکەوتنەوە. منیش ئەمرۆ لەهەشتاو هەشت سالیدا هەوڵ دەدەم وابکەم."

[1].W. Frasier

١٣٠

ئەم تیکستە لەشیعریکی جۆن مویرەوە[1] هەلبژیردراوە:

"دەمەویت رۆحم ئازاد بکەم تابتوانیت لەهەموو ئەو توانایانە بەهرەمەند بیت کەگیانەکان هەیانە. کەرۆحم ئـازاد بـوو، چیـدی نەهـەوڵ دەدەم چـاڵو چۆلیـەکانی مانگ بناسمو، نەبەدوای تیشکەکانی خۆردا تاسەرچاوەکەیان بـرۆم. نەهـەوڵ دەدەم پـەی بـەجوانی ئەسـتیرە بـەرم نەهـەولیش دەدەم پـەی بەشـیواوی دەسـتکردی مرۆڤ بەرم.

"کاتـێ فـیربووم رۆحـم ئـازاد بکـەم، بـەدوی کـازیوە دەکـەومو لەگـەلیدا دەگەریمەوە. کاتێ فیربووم گیانم ئازاد بکـەم، پەیوەسـت دەبم بـەو تەوژمانـەوە کـە بۆ ئۆقیانوس دەرۆن، تا گیانی جیهان پیك بهینن.

"کاتێ فیربووم گیانم ئـازاد بکـەم، هـەوڵ دەدەم نامـەی پـر لەشکۆی ئـەفراندن، لەسەرەتاوە بخوینمەوە".

---

[1]. John Muir

# ١٢١

یەكی لەنیشـانە پیرۆزەكـانی مەسـیحیەت، وینـەی ماسـیگرەیە. هۆكـەی سـادەیە: لەقاتو قری رەهای خواردندا، ماسیگرە دەنوكی لەلەشـی رۆ دەكـات تـا بیچووەكـانی بەگۆشتی لەشی خۆی تیر بكات.

پیر دەلیت:

" زۆربـەی كـات لەپـەی بـردن بـەو بەهرانــەی پیمـان دراوە دەستەوەســتانین. زۆربـەی كـات پـەی بـەوە نابــەین كەئــەو بەمەبەسـتی پــەروەردە كردنــی لایــەنی مەعنـەوی ئیمـە ئـەنجامی دەدات. چیرۆكیك دەربـارەی ماســیگرەیەك هەیــە كەلــە زستانیكی سەختدا لەپیناوی تیركردنی بیچووەكانی خۆی بەخت كرد. كاتی كەسەر ئەنجام لەلاوازیدا گیانی سپارد، یەكی لەبیچووەكان بەویتریانی گوت: ( سـەرئەنجام ئاسوودە بووین! لـەوەی كـە هـەموو رۆژی ئـەو شـتە بۆگەنـەمان دەخـوارد، خـەریك بووم وەرەز دەبووم.)"

ئەگەر لەشتێك نارازیت - هەتا ئەگەر ئەو شتە ئەو كارە باشەش بێت كە حەزت لییەتی، بەلام تائێستا نەتتوانیوە ئەنجامی بدەیت - دەست هەلگرە.

ئەگەر كارەكان بەباشی ناچنە پێشی، تەنیا دوو روونكردنەوە شیاوە هەبن: یان تواناو وزەت خراوەتە ژێر تاقی كردنەوەوە یان دەبێت گۆرانێك لەرێگاكەتدا پێك بهێنی.

بۆئەوەی دەریخەیت كامە دانە لەم دوو هەلبژاردنە – هەلبژاردنە لێكدژەكان - راستە، بێ دەنگی بكەرە پیشەو دەستی نزا بەرز بكەرەوە. كەم كەم بارودۆخەكە وا روناك دەبێتەوە كەدەتوانیت یەكی لەئیختیارەكان هەلبژێریت.

كاتی بریاری خۆتدا، ئیختیارەكەیتر بەتەواوی بەفەرامۆشی بسپێرە. بۆپێشەوە برۆو بزانە كەخواوەند خودای ئازایانە.

دومینگوس سابینۆ[١] گوتویە:" هەموو شتی روو لەباش بوونە. ئەگەر بارودۆخەكان باشتر نابێت، هۆكەی ئەوەیە تۆ هێشتا بە ئامانجەكەت نەگەیشتوویت."

١. Domingos Sabino

## ١٢٣

مۆسیقاری بەرازیلی، نیلسۆن مۆتا[1]، لەباهیا[2] بوو کە بڕیاریدا بڕوات بۆ سەردانی دایە مینینها[3]. تەکسی بەکری گرتو لەڕێگە ستۆپی ئوتومبیلەکە پچڕا. ئوتومبیل لەناوەڕاستی شەقامدا سوڕا، بەڵام جگە لە پێکهێنانی ترس، ڕوداوێکی گرنگیتر ڕوینەدا.

کاتی چاوی بەدایکە مینینها کەوت، یەکەمین شتی کە بەوی گوت، کارەساتی ئوتومبیلەکە بوو لەناوەڕاستی شەقامەکەدا.

دایکە گوتی: " شتگەلیك هەن کە لەپێشەوە نوسراون. بەڵام خواوەند ڕێگەیەك دەخاتە بەر دەممان تابی گرفتیکی وا لەو ڕوداوە تێپەڕین. بۆنمونە بەشی لەچارەنوسی تۆ ئەوە بوو کەلەم ساتەی ژیانت دا سەر نشینی ئوتومبیلی بێت کەدوچاری ڕوداوی دەبیت. بەڵام هەر بەو جۆرەی کەدەبینیت، هەموو شتیك ڕویدا و هیچ شتیکیش ڕوینەدا."

---

[1]. Nelson Motta
[2]. Bahia
[3]. Mother Meniniha de Gantois

ژنیکـی زیارەتکـەر، کـاتی لەگـەل نوســـەردا کۆنفرانســـەکەی بەجیدەهیشــت، بەنوسەری گوت: " لەفسەکانتدا لەبارەی ریگای سانتیاگۆوە[1] شتیکت لەبیر کرد.

" من هەستم کرد زۆربەی  زیارەتکـەران، چ لەریگـەی سـانتیاگۆداو چ لـە رەوتـی ژیانی خۆیاندا، هەول دەدەن هاوهەنگاو لەگەل خەلکیدا ریبکەن.

"لەسـەرەتای گەشـتە سـەردانیکمدا، هـەولم دەدا هاوهـەنگاو لەگـەل گروپەکــەدا برۆم. ماندوو بووم. لەوەندەی لەشم دەیتوانی، زیاترم لیی دەویست. زۆرم بۆهاتبوو لە دەزووله زەردەکانی قاچی چەپمدا توشی نارەحەتی هاتم، بۆمن ئەستەم بـوو دوو رۆژ بی راوەستانو بەردەوام بەپی بـرۆم، زانیـم تەنـها بەشـیوەیەك دەتـوانم بگەمـە سانتیاگۆ ئەویش بەوەی ریگەکە بەپیی خۆم ببرم.

" گەشتەکەی من ماوەیەکی زیاتر لەوانی دی دریـژەی خایـاند، ماوەگـەلیکی زۆر تەنها بووم. بەلام تەنیا لەبەرئەوەی ریزم بۆ هەنگاوەکانی خۆم دانا، توانیم هــەموو ریگەکـە بـبرم. لـەوە بـەدوا، مـن ئـەو وانەیـەم لەهـەموو ئـەو کارانـەدا بــەکارهیناوە کەلەژیانمدا ئەنجامیان دەدەم.

---

[1] .بگەرینەوە بۆ کتیبی گەشت بۆ دەشتی ئەستیران، کە بەرهەمی هەمان نووسەرە.

## ١٢٥

کرۆسیوس[1]، پاشای لیدیا[2]، بڕیاری دابوو هێرش بکاتــە ســەر ئێرانیــەکان. لەگــەڵ ئەوەشدا ویستی ڕاوێژ بەپێشبینیژەکانی پەرستگەی دەلفی یۆنان بکات.

پێشبێژ گوتی: " مقەدەرە ئیمپراتۆریەتیکی گەورە بەدەستی تۆ ویران ببێت."

کرۆسیوس بەشادمانییەوە جەنگی ڕاگەیاند. لەپاش دوو ڕۆژ شەڕ، لیدیا کەوتــە دەســت ئێرانیــەکان، پایتەختەکــەی ویــران کــراو کرۆسیۆســیش بــەدیل گــیرا. ئــەو بەتورەییــەوە داوای لەکۆنســۆلەکەی کــرد کــە بچێــت بــۆ یۆنــان و بەکاهینەکــەی پەرستگەی دەلفی بلێت لەپێشبینیەکەیدا چەندە بەهەلەدا چووە.

کاهین بەکۆنسۆلەکەی گوت" نــەخێر. ئــەوەی هەڵــەی کــرد تــۆ بوویــت. تــۆ ئیمپراتۆریەتیکی گەورەت لەناو برد: لیدیا."

پیر دەلیت:

" زمانی نیشانەکان لەبەرامبەر ئیمەدان، تــا باشــترین ڕیگامــان فێربکــەن، بــەلام زۆربەی کات هەول دەدەین نیشانەکان وەها ئاوەژوو بکەینەوە کە لەگەل ئەو شــتەدا بگونجێن کەپێشتر دەمانویست بیکەین."

[1]. croesus
[2]. Lydia

بوســكاليا[1] چیرۆکێ دەگیریتــەوە کەلــەبارەی چوارەمــین ماگۆســیکەوە، کــە درەوشانەوەی ئەستیرەیەکی بەسەر" بیت اللحم"ەوە بینی.

ئەو هەمیشە درەنگ دەگەیشتە ئەو شوینەی کەدەبوو عیسای لی بیت، لەبەر ئەوەی لەریگەدا هەژاران‌و موحتاجان بۆ داواکردنی کۆمەك رایاندەگرت.

لەپاش سی سال گەران بەدوای عیسادا لەمیسرو جەلیل‌و بتانی[2]، ماگۆسی" زەردەشتی"یەکە گەیشتە ئۆرشەلیم، بەلام دیسان درەنگ ببوو، عیسای چکۆلــە ئیســتا ئیــدی ببــووە پیــاویك، ماگۆســی‌یەکە ریــك لــە رۆژی لــەخاچدانی عیسادا گەیشتە ئەوی.

ماگۆسی‌یەکە چەند دانە دوریکی لەگەل خۆیدا هینابوو تاپیشکەش بەعیسای بکات، بەلام هەموو شتیکی فرۆشت بوو تاکۆمەکی ئەو کەسانە بکات کەلەریگادا بینیبوونی. تەنها یەك دانە دوری بۆ مابووەوە. بەلام رزگارکەر بەسەر خاچەوە گیانی سپارد بوو.

ماگۆســیەکە بــیری کــردەوە: " مــن لەبــەجی هینــانی ئــەرکی ژیــانمدا شکستم خوارد."

---

[1]. Buscaglia
[2]. Bethany

ئالەو کاتــەدا گویــی لــەدەنگیك بــوو: " بەپیچەوانــەوەی ئــەوەی تــۆ گومــانی دەکەیت. تۆ لە هەموو ژیانتدا لەگەل مندا بوویت. روت بـووم، پۆشـتەت کردمـەوە. برسـی بـووم تـیرت کـردم. دیـل بـووم هاتیتـە دیدەنیـم. مـن لـەگیانی هـەموو ئــەو بیچارانـــەدا بـــووم کەلـــە ریگـــەدا بینیـــتن. لەبـــەر ئـــەم هـــەموو دیاریـــە ئەویندارانەیە سوپاسگوزارم."

لەچیرۆکیکی خەیالی زانستیدا، باس لە کۆمەلگەیەك کراوە کە  نزیکەی هەموو ئەندامەکانی لەکاتی لەدایك  بوونیانەوە، پسپۆرییەکی تایبەتیان هەیە: فیرخواز، ئەندازیار، فیتەر، تەنیا ژمارەیەکی کەم نەبیت کەبی لیهاتووییەکی تایبەتی لەدایك دەبن. ئەم ژمارەکەمە دەنیردرین بۆ شیتخانە،  لەبەرئەوەی تەنها مرۆڤە تەمەلو گەلۆرەکان ناتوانن لەکاروبارەکانی کۆمەلگەدا بەشداری بکەن.

یەکی لەشیتەکان یاخی دەبیت. شیتخانەکە کتیبخانەیەکی هەیە، شیتەکە هەول دەدات لەوی هەرچی بۆ فیربوون لەبارەی زانستو هونەرەوە هەیە فیری ببیت. کاتی کە پیی وایە بەئەندازەی پیویست فیربووە، بریاری هەلاتن دەدات، بەلام دەستگیر دەکریتو دەنیردریت بۆسەنتەری تویژینەوە لەدەرەوەی شار.

یەکی لەبەرپرسانی سەنتەرەکە دەلیت: " بەخیرهاتی. ئیمە ئافەرینی ئەوانە دەکەین کەخۆیان ریگەی خۆیان هەلبژاردووە. لەئیستا بەدواوە دەتوانیت هەرکاری حەزت لییەتی ئەنجامی بدەیت، لەبەرئەوەی بەهۆی بەرەکەتی کەسانی وەکو تۆوەیە کەجیهان دەتوانیت پیشبکەویت[١].

---

[١]. ئۆلەمپیکی ئوتومبیلان، بەرهەمی ئیزاك ئاسیمۆف.

## ١٢٨

بازرگانی لەپیش گەشتیکی دوور و دریژیدا، خوا حافیزی لەهاوسەرەکەی دەکرد.

ژنە گوتی: " تائیستا دیارییەکت بۆ نەهیناوم نرخی خۆمی هەبیت."

کابرا گوتی: " ئەی ئافرەتی پینەزان، هەرچیم بۆ هیناویت، بەنرخی سالەهای سالْ کارو هەولدانم بووە. دەتوانم چ شتیکیترت بدەمی؟"

ژنە گوتی: " شتیك کەهیندەی من جوان بیت."

دووسالی تەواو، ژنە چاوەروانی دیارییەکەی بوو. سەرئەنجام میردەکەی گەرایەوە.

کابرا گوتی: " توانیم ئەو شتە پەیدا بکەم کەهیندەی تۆ جوان بیت، من بۆ سپلەیی تۆ زۆر گریام، بەلام سەرئەنجام بریارمدا ئەوەی تۆ داوات کردوە ئەنجامی بدەم. لەتەواوی ئەم ماوەیەدا پیم وابوو شتیك نییە هیندەی تۆ جوان بیت بەلام شتیکم دۆزیەوە."

و ئاوینەیەکی دا بەهاوسەرەکەی.

فەیلەسوفی ئـەلمانی، ف. نیچەه[1]، گوتویـە: " کـات سـەرفکردن بـۆ بـاس‌و خـواس دەربارەی هەرشتی، کاریکی بی نرخە. ئەوە بەشیکە لەسروشتی مـرۆڤ کەبـەردەوام سەهو بکات."

پـیر دەلیـت: " خـەلکیك هـەن لەسـەر ئـەو خالـە پیدادەگـرن کەلەهـەموو مەسەلەیەکدا، تەنانەت لە وردەکارییەکانیشدا، ئەوان لەسەر هەقن. ئەوانە زۆربـەی جار ریگە بەخۆیان نادەن هەلە بکەن. تەنها شتیك کەئەمانە بەم جـۆرە کردارەیـان بەدەستی دەهینن.ترسانە لە بەرەو پیشەوە چوون.

"ترس لەهەلە کردن دەرگایەکە ئیمە لەقەلای میانحـالیدا زینـدانـی دەکـات. گـەر توانـای سـەرکەوتن بەسـەر ئەوترسـەمان هـەبیت، هـەنگاویکی گرنگمـان لەریگـەی ئازادیدا ناوە."

---

[1]. F. Nietzsche

کەسی کەتازە باوەری هینابوو، لەپەرستگەی سیتا، لەباوکی گەورە نیستڕۆسی[١] پرسی: " ئەو کارانەی کەدەبیت بۆ شادمان بوونی خودا بیانکەم چین؟"

باوکە وەلامی دایەوە: " ئیبراهیم پیشوازی لەغەریبان کردو خودا شادمان بوو، ئەلیاسیش غەریبانی خۆش نەدەویست خودا کامەران بوو. داود بەو شتەی کەئەنجامی دابوو مەغرور بوو و خودا شادمان بوو. کار بەدەستیکی رۆمی لەبەرامبەر میحرابدا لەوکارەی کردبووی خەجالەت بوو کەچی خواوەند کامەران بوو. یەحیای تەعمیددەر[٢] چوو بۆ بیابانو خودا شادمان بوو. یونس چوو بۆ شاری گەورەی نەینەواو خودا شادمان بوو.

" لەرۆحت بپرسە دەیەویت چی بکات. کاتی رۆحت لەگەل خەونەکانتدا بگونجیت، خواوەند شادمان دەبیت."

---

١. Nisteros
٢. John the Baptist

پیریکی بودایی لەگەل  قوتابیەکانیدا بەپی گەشتی دەکرد. لەپر هەستی کرد قسەوباسی لەنیوان قوتابییەکانیدا لەسەر ئەوەی باشترین کەس کییە، سەریهەلداوە.

یەکی گوتی: " من پانزدە سالە مەشقی چاودیری دەکەم."

یەکیکیتر گوتی: " من لەو کاتەوەی مالی باوك‌و دایکم جیهیشتووە، لەپەیوەند بەموحتاجانەوە دەستودل سەخی بووم."

سیهەمیان گوتی: " من هەمیشە ملکەچی فەرمانەکانی بودا بووم."

کاتی نیوەرۆ، بۆپشودان لەژیر دارسیویکدا باریان خست. لقەکانی درەختەکە لەژیرباری ئەو میوانەی کەپیوەی بوون واچەمابوونەوە کەلە زەوی دەخشان.

پیر گوتی: " کاتیك درەختیك بەری زۆرە، لقەکانی بەرەو زەوی شۆر دەبنەوە، ئاقلی راستەقینە ئەوەیە بیفیز بیت.

" کاتیك درەختی هیچ بەری نەهینی، لقەکانی لەخۆبایی‌و سەرکەشن. پیاوی بی ئەقل پییوایە کەلەکەسانی دی باشتریکە."

# ١٣٣

ئەنتۆنیۆ ماخادۆ[1] دەلیت:

" هەناسە بەهەناسە، هەنگاو بەهەنگاو،
ئەی ریپیشاندەر، رییەك نییە،
ریگە بۆ هاتو چۆ دروست كراوە
بەهاتو چۆ ریگە دروست دەبیت.
ئەگەر ئاور بدەیتەوە، ئەوەی دەیبینی شوینپیكانی تۆیە،
كەرۆژیك، دووبارە پییەكانت ئەوانە تەی دەكاتەوە
ئەی ریپیشاندەر، رییەك نییە،
ریگە بۆ هاتو چۆ دروست كراوە."

---

١. Antonio Machado

## ١٣٣

لەدوا شیودا، عیسا دووان لەحەوارییەکانی خۆی تۆمەت بار کرد – بەتوندی وبە دەربرینی وەك یەك. هەر دووکیان گوناهگەلیکیان کرد بوو کە عیسا پیشبینی کردبوو.

یەهودای ئەسخریۆتی هاتەوە هۆش خۆیو خۆی مەحکوم کرد. پەترۆسیش هاتەوە هۆش خۆی، بەلام لەپاش ئەوەی کەسی جار نکولی لەتەواوی ئەو شتانە کرد کە بروای پییان هەبوو.

بەلام لەدواین ساتدا، پەترۆس واتای راستەقینەی پەیامەکەی عیسا تیگەیشت. داوای بەخشینی کردو بەخۆ کەم گرتنەوە دریژەی پیدا.

ئەو دەیتوانی دەرونکوژی هەلبژیریت، بەلام بەپیچەوانەوە روی کردە حەوارییەکانی ترو گوتی: " زۆر باشە، با تا ئەو کاتەی رەگەزی مرۆڤ هەیە، باس لە گوناهەکەی من بکەن، بەلام ریگە بدەن تاوانەکەم قەرەبوو بکەمەوە."

پەترۆس دەیزانی کە ئەوین لەگوناه خۆش دەبی، بەلام یەهودا پەی بە هیچ نەبرد.

### ١٣٤

نوسەریکی بەناوبانگ لەگەل هاورییەکیدا  لەسەر جادە پیاسەیان دەکرد کاتی لەپر کوریکی بینی پەرییە بەردەم کامیۆنیك. نوسەر لەکەمتر  لەچرکەیەکدا خۆی گەیاندە بەردەمی کامیۆنەکەو توانی کورە رزگار بکات. بەلام لەپیش  ئەوەی کەسی فرسەت بینیو بەبۆنەی ئەم کارە  قارەمانانەیەوە ستایشی بکات، زلەیەکی توندی سرەواندە پەناگویی کوریژگەکە.

نوسەر گوتی: " بەروالەت مەخەلەتی کوری خۆم. من تەنیا بۆئەوە رزگارم کردیت تا نەتوانیت شان لەژیرباری ئەو کارانەدا خالی بکەیتەوە کەلە گەورەییدا دەکەویتە ئەستۆت."

پیر دەلیت:

" هەندی کات لەئەنجام دانی کاری چاکە دەترسین. کاتی کاریکی مەزن ئەنجام دەدەین، هەستی گوناهی ئیمە هەول دەدات پیمان بلی تەنیا بۆ کاریگەری دانان لەسەر کەسانی دی دەستمان بۆ ئەم کارە بردوە. دژوارە قبولی بکەین کەسیکی باشین. کارە چاکەکانمان بەتانەو بی گوینەدان دادەپۆشین، وەك ئەوەی بلییت ژیان هاوتای لاوازیە."

عیسا سەیری میزەکەی بەردەمی کـردو قـول بەبیرکردنـەوەدا رۆچـوو کـە کامـە شـت دەتوانیـت باشـترین نیشانەی پەیامەکـەی بیـت لەسـەر زەوی. لەسـەر میزەکـە، هـەناری ناوچـەی جـەلیل، بـەهاراتی بیابـانی باشـور، میـوە وشـکەکانی سـووریاو خورمای میسر هەبوو.

دەسـتی دریژکـرد تـا یـەکیکیان تەبـەروك بکـات. بـیری کەوتـەوە ئـەو پەیامـەی هیناویـەتی بـۆ هـەموو مرۆڤەکانـە لەهـەر کوییـەك هـەن، رەنگـە هـەنارو خورمـا لەهەموو شوینی بەرهەم نەیەن.

سـەیری چواردەوری خـۆی کـردو بـیریکیتری بەمیشکدا هـات. لـە هـەنارو خورمـاو میوەکاندا، موعجیزەی ئەفراندن بەبی خۆتیهەلقورتاندنی مرۆڤ خۆی نمایش دەکات.

پاشان نانەکەی هەلگرتو سوپاسگوزاری کرد، لەتی کـردو دای بەقوتابییـەکانیو گوتی: " هەمووتان، وەریبگرنو بیخۆن، ئەمە جەستەی منە."

لەبەرئـەوەی نـان لەهـەموو شـوینیك هەیـە. نـان لەبەرامبـەر خورمـاو هـەنارو میوەکـانی سـوریادا، باشـترین نیشـانەی ریگـە بـەرەو خودایــە. نــان، میــوەی زەویو رەنجی مرۆڤە."

شەعوەزەبازیك لەناوەراستی بـازاری مـەكارەدا(هەفتـە بـازار) راوەسـتاو سـی پرتـەقالی لـەگیرفانی دەرهینـاو دەسـتی كـرد بـەیاریپیكردنیان. خـەلكی سەرسـام لەناسكیو خۆشی جولەكانی ئەو، لەدەوری ئالان.

پیاویك كە لەنزیكی نوسەرەوە وەستابوو گوتـی: " ئەمـە ئـەو شـتەیە كـە ژیـان كـەمو زۆر ویـی دەچیت. ئیمـە هەمیشـە دووپرتـەقالمان بـە هـەردوو دەسـتەوەیەو پرتـەقالیكیتر بـە ئاسمانەوەیـە. بـەلام ئـەو پرتەقالـەی بەئاسمانەوەیـە هـەموو مەســـەلەكە دەگۆریـــت. بـــەلیزانییو دەستســـوكیەوە فریـــدەدری، بـــەلام ریگەی خۆی دەبری.

" ئیمـەش، وەكو ئـەم دەستسوكە، خـەونیك لەجیهاندا بـەرەلا دەكـەین، بـەلام هەمیشە دەسەلاتمان بەسەریا نییە. لەكاتو سـاتیكی ئاوهـادا، دەبیـت بزانیـت چۆن چۆنـی خـۆت بـەخودا بسـپیریتو بتـەویت خەونەكـەت لـەكاتی گونجـاودا ریگاكـەی خۆی بەریكی ببریتو كاتی كەپیگەیشت، دووبارە بگەریتەوە بۆناو دەستەكانت."

یەکی لەکاریگەرترین راهینانەکان بۆ هەلدان و پیگەیشتنی دەرونیی، سەرنج دانە لەو کارانەی کەئیمە بەشیوەیەکی خۆبەخۆ ئەنجامی دەدەین - وەکو هەناسە هەلکیشان، چاوتروکاندنو تەماشاکردنی دەوروبەر.

کاتیك واهی دەکەین، ریگە بەمیشکی خۆمان دەدەین بەئازادییەکی زیاترو بەبی خۆتیهەلقورتاندنی تکاکانمان کاربکات. هەندی مەسەلە کەواهی دینە پیش چاو چارەسەر ناکرین، چارەسەر دەبنو، هەندی ئازار کەهەرگیز پیمان وانەبووە بتوانین بەسەریا زال بین، بەبی هیچ هەولیکی تایبەتی پەرشو بلاو دەبنەوە.

پیر دەلیت:

" لەکاتگەلیکدا کەدەبیت رووبەرووی هەلو مەرجگەلیکی دژوار ببیتەوە، لەم فیلە کەلك وەربگرە. تەنیا تۆزقالیك دیسپلین پیویستە - بەلام ئاکامەکان دەتوانن سەرسورهینەر بن.

١٣٨

پیاویك لەپیشانگایەكدا  گولدانی دەفرۆشت. ژنیك نزیك بووەوەو لەشتەكانی ورد بووەوە. هەندیكیان سادەو بی جوانكاری بوون، بەلام هەندیكیشیان زۆر ناسك بوون.

ژنە نرخی گولدانەكانی پرسی، كە زانی نرخی هەموویان وەك یەكە، سەریسورما.

ئەو پرسی: " بۆچی گولدانە نەخش دارەكانو گولدانە سادەكان یەك نرخیان هەیە؟ بۆچی بۆ ئەو گولدانانەی كەكاتو زەحمەتیكی زیاتریان بردوە، هەمان پارەی گولدانیكی سادە وەردەگری؟"

فرۆشیار گوتی: " من هونەرمەندم. نرخی ئەو گولدانە  وەردەگرم كە دروستم كردوە. جوانیی بەخۆراییە."

نوسـەر لەبۆنەیـەکدا بەتـەنیا دانیشت بـوو لـەپر دۆسـتی لیـی نزیـك بـووەوەو گوتی: " دەبیت لەگەل تۆدا قسە بکەم."

نوسـەر لـەم چاوپیکەوتنـەدا نیشـانەیەکی بینـیو دەسـتی کـرد بەقسـەکردن دەربـارەی ئـەوەی خـۆی بـەگرنگی دەزانـی، ئـەو لـەبارەی بـەهرەکانی خواوەنـدەوە قسەی کرد، لەئەوینو لەو هەقیقەتەی کەلەگەیشتنە جیـی هاوریکـەی نیشـانەیەکی لە فریشتەکەیەوە پیگەیشتووە، لەبەرئەوەی چەند سـاتی پیشـتر بەتەنـها بـەرەلاکرا بوو، بەلام ئیستا هاورییەکی هەبوو.

هاوریکـەی، بـەبی ئـەوەی یـەك قسـەبکات گویـی لـە قسـەکانی نوسـەر گـرتو، سوپاسی کردو لییدا رۆشت.

نوسەر لەحیاتی خۆشحالی، لەپیشتر زۆرتر هەستی بەتەنهایی کـرد. پاشـان بـۆی دەرکـەوت لـەو حالـەتی شۆروشـەوقەدا، هیـــچ گرنگییـــەکی بـــەو شـــتە نـــەداوە کەدۆستەکەی دەیویست لەبارەیەوە قسە بکات.

سەیریکی خوارەوەی کردو بینی وشەکانی کەوتونەتـە سـەر زەوی. لەبەرئـەوەی کەجیهان لەو ساتەدا دەیویست شتیکیتر روبدات.

سی پەری بۆ ریورەسمی تەعمیددانی شـازادەیەك بانگهیشـتكران. یەكـەمین پـەری، دیـاری بەدەسـتهینانی عەشـقی بەشـازادەدا. دووەمیـان ئـەوەندەی پارەدایـە كـەبتوانیت هەركاریك كەدەیەویت، بیكات. سیهەمین پەری جوانی پیشكەش بەشازادە كرد.

بەلام، وەكو هەموو ئەفسانەیەكی پەرییان، ژنە جادوگەریك لەریوە گەیشت.

ژنـەی جادوگـەر زۆر لـەوە تـورە بـوو كـەبۆ ریورەسمەكـە بانگهیشـت نـەكرابوو، دەستی كرد بەدوعا كـردن لـە شـازادە: "دەبینـم كـەتۆ پیـش وەخـت هەمووشـتیكت هەیە. لەبەرئەوە دەمەویت لەوە زیاترت پی ببەخشم. تۆ توانای هـەركاریكت دەبـی كەهەول بدەیت ئەنجامی بدەیت.

شازادە گەورە بوو پیگەیشت، جوانو سامانداربوو و ئەوینەكەیشـی دۆزییـەوە. بەلام هـەرگیز نـەیدەتوانی ئـەو كارانـەی پیـی دەسـپیردرا لەسـەر زەوی بەئـەنجامی بگەیـەنی. ئـەو لەوینەكیشـان، پەیكەرسـازی، موزیـكو بیركـاریدا قـول بـوو بـووەوە، بەلام هیچ كـاتی نـەیدەتوانی كـاریك تاكۆتاییەكـەی ئـەنجام بـدات. چونكـە زۆر زوو بیرورای دەگۆریو كەمەندكیشی كاریتر دەبوو.

پیر دەلیت:

" هـەموو ریگاكـان بەیـەك شـوین كۆتاییـان دیـت، بـەلام تـۆ ریگـەی خـۆت هەلبژیرەو تاكۆتاییەكەی ببیرە. هەول مەدە بەهەموو ریگاكاندا برۆیت."

١٤١

نوسینی نوسەریکی ناشی چەرخی هەژدە، دەربارەی راهیبیکی روسی دەدویت کە بەدوای پیریکی مەعنەویدا گەرابوو.

رۆژی پییان گوت لەفلان گوند پارسایەك دەژی شەوو رۆژی خۆی بۆ رزگارکردنی رۆحی خۆی تەرخان کردوە. راهیب چووە شوین کابرای پارسا.

کاتی پارسای دۆزییەوە، پیی گوت: " دەمەویت بەدریژایی ریگای رۆح، رینماییم بکەیت."

پارسا وەلامی دایەوە: " گیان ریبازی خۆی هەیەو فریشتەکەت رینماییت دەکات. بی وەستان بەخواپەرستیەوە سەرقالبە."

کابرا گوتی: " نازانم چۆن چۆنی خواپەرستی بکەم. تۆ ئەو خواپەرستییەم فیر دەکەیت؟"

پارسا گوتی: " ئەگەر نازانیت چۆنچۆنی خواپەرستی بکەیت، ئەوا داوا لەخواوەند بکە فیرت بکات."

کابرا گوتی: " تۆهیچم فیرناکەیت."

پارسا گوتی: " شتیك بۆ فیربوون بوونی نییە؛ لەبەرئەوەی کەناتوانری باوەر وەکو ماتماتیك کەدەگویزریتەوە، بگویزریتەوە. رازی باوەر قبول بکە. جیهان خۆی ئەو رازەت بۆ ئاشکرا دەکات.

## ١٤٣

پیر دەلیت:

" بنوسە! هەرچیت دەویت بینوسە؛ نامە، بیرەوەری رۆژانـە، یـان تەنانـەت ئـەو یاداشتانەی کەلە وتوویژی تەلەفۆنیکەوە کەهەلیدەگریت بینوسە - تەنها بنوسە!

" بەنوسین، لەخواو لەخەلکی نزیك دەبینەوە. گەر دەتەویت بگەیت بـەدرکیکی باشـتر لەمـەر پیگەی خـۆت لـە جیهاندا، بنوسـە. هـەولبدە حـەزت لەنوسـین بیـت، تەنانــەت ئەگــەر هیــچ کەســی وشەکانیشــت نەخوینیتــەوە - یــان لــەوە خراپــتر، ئەوشتانەی کەنەتدەویست بخویندرینەوە، کەسیك بیخوینیتەوە.

" نوســین یاریدەمــان دەدات سەروســامان بــەبیرو بۆچوونــەکانمان بدەیــن. ئەوشتانەی لەچواردەورمانن بەرونییەکی زیاترەوە ببینین.

" پینـوسو کاغـەز موعجیزە دەکـەن. ئازارەکـان سوك دەکـەن، بـەرگی کـردەوە دەکەن بەبەری خەونەکانماندا‌و ئومیدە لەدەست چووەکان زیندوو دەکەنــەوە. وشـە دەسەلاتی هەیە."

راهیبانی بیابان  باوەریان وابوو کەدەبیت ریگە بەدەستی فریشتەکان بدریت بینە نیو کارەوە. ئەوان بۆ بەدیهینانی ئەم باوەرە، دەستیان دەدایە کردنی کارگەلیکی بەروالەت  بیهودە- وەکو قسەکردن لەگەل گولانو پیکەنین بەبی هۆ. کیمیاگەران بەدوای نیشانەکانی خودادا دەکەون، ئەوسەرە دەزوانەی بی بایەخ دینە بەرچاو، سەرئەنجام مرۆڤ بۆ جیگەیەك رینوینی دەکەن.

پیر دەلیت:

" نیگەران مەبە لەوەی کەسانی دی بەشیتت بزانن. ئەمرۆ کاریك بکە کە بەهیچ جۆری لەگەل ئەو لۆژیکەدا ناگونجی کەفیری  بووی، بەجۆریك رەفتار بکە کەپیچەوانەی ئەو کردەوە پیگەیشتوانەیە بیت کەفیریان کردویت. ئەم کارە بچوکە، بەبی لەبەرچاوگرتنی بچوکییەکەی، دەتوانیت دەرگایەك بە روی روداویکی گەورەدا بکاتەوە - مرۆڤو مەعنەویەت."

## ١٤٤

تازەپیاکەوتوویەك سواری مارسیدسیکی جوان بوو، لەپڕ یەکی لە تایەکانی مارسیدسەکە پەنچەر بوو. کاتی ویستی تایەی ئوتومبیلەکەی بگۆڕی، سەیری کرد جەکی پی نیە. بیری کردەوە: " گرنگ نیە. دەچم بۆ نزیکترین ماڵو داوا لەخاوەن ماڵەکە دەکەم جەکیکم بەقەرز بداتی."، بەدوای کۆمەکدا کەوتە ڕی.

لەڕیگە بەخۆی گوت: " ئەو کەسەی کەدەمەویت بەقەرز جەکی لی وەربگرم، ڕەنگە بەبینینی ئوتومبیلیکی ئاواو من کەبەدوای یارمەتی دا دەگەریم بکەویتە بیری ئەوەی دە دۆلارم لی دابتەکینی، ڕەنگە داوای پەنجا دۆلار بکات. ئاخر ئەو دەزانیت کەمن بەراستی پیویستم بەجەك هەیە ڕەنگیشە لەبارودۆخەکە کەلکی خراپ وەربگریتو سەد دۆلارم لی بسەنی."

هەروا کەریگەی دەبری، نرخەکە بەرزدەبووەوە. کاتی گەیشتە نزیکترین ماڵو خاوەن ماڵەکە دەرگای کردەوە، کابرا هاواری کرد: " تۆ دزیت. جەکی ئەوەندە ناهینی. جەکەکەت هەڵگرە بۆخۆت."

کی لەئیمە ئەتوانیت لافی ئەوە لیبدات کەتائیستا یەکجاریش بەم شیوەیە ڕەفتاری نەکردوە؟

میلتۆن ئەریکسۆن[1]، داهینەری ریبازیکی نویی چارەسەرکردنە کە حالی حازر لەولاتە یەکگرتووەکاندا هەزاران پەیرەوی هەیە. کاتی دوازدە سالان بوو، دوچاری ئیفلیجی مندالان بوو. دە مانگ دواتر، گویی لی بوو پزیشکەکە بەدایكو باوکی دەگوت: " کورەکەتان ئەمشەو ناگاتە بەیانی."، هەروەها گویی لی بوو دایکی دەگریا.

لەدلی خۆیدا بیری کردەوە: " کی دەزانیت، رەنگە ئەگەر من بتوانم ئەمشەو زیندو بمینمەوە، دایکم ئەوەندە نارەحەت نەبیت.". بریاریدا تا بەیانی نەخەوی. کاتی خۆر هەلات، بەهاوارکردنەوە بەدایکی گوت: " هەی، من هیشتا زیندووم!" خۆشیو شادی لەمالەکەدا بەرادەیەك زۆر بوو کە بریاریدا هەموو رۆژی هەول بدات شەویکیتریش بەزیندویتی بمینیتەوە، تالەم ریگەیەوە یەك رۆژیتریش ئازارو رەنجی خیزانەکەی دوابخات.

ئەو لەسالی ١٩٩٠دا، ئەو کاتەی کە ٧٥سال تەمەنی بوو چاوەکانی لیکنا، لەحالیکدا لەپاش خۆی ژمارەیەك کتیبی بەنرخی لە بواری توانای سەرسوورهینەری مرۆڤ لەسەرکەوتن بەسەر سنوردارییەکانیدا، بەجی هیشت.

---

[1]. Milton Ericsson

پارسایەك بەباوکە گەورەی گوت: " ئەی پیاوی خودا، دلم لیوان لیوە لەئەوینی جیهانو بی گەردە لەوەسوەسە شەیتانیەکان. هەنگاوی دواتری من چییە؟"

باوکە داوای لیکرد لەگەلیا بچیت بۆ ریورەسمی دان پیانانی پیاویك کە گیانی دەدا.

لەپاش دلنیا کردنی خیزانەکە، باوکە سەرنجیدا، بۆفییەکی لەگۆشەیەکدا بینی، پرسی: " ئەو بۆفییە چی تیایە؟"

برازایەکی کابرای سەر گیانەلا وەلامی دایەوە: " ئەو جلانەی تیایە کەمامم هەرگیز لەبەرینەکردن. ئەو پیی وابوو کەدەبیت ئەوجلانە لەکاتو ساتیکی تایبەتدا بپۆشی، بەلام ئەوەندە لەبەرینەکردن تالە بۆفییەکەدا رزین.

کاتی ئەوییان بەجی دەهیشت، باوکە بەپارسای گوت: " ئەو بۆفییە لەیادمەکە. ئەگەر گەنجینەگەلیکی مەعنەویت لەدلتا حەشارداوە، ئەوا هەر لەئیستەوە بیانخەرەکار، ئەگەرنا لەناو دەچن."

عارفان دەلین: " کاتی ریگەی مەعنەوی دەگرینە بەر، دەمانەویت زۆربەی کاتی خۆمان بەقسە کردن لەگەل خودادا تیپەرینین. سەرئەنجام، گوی بۆ ئەو شتانە رانادیرین کەئەو دەبیت بیانلیت.

پیر دەلیت:

" تۆزیك ئارام بگرە. ئاسان نییە. ئیمە پیویستیەکی سروشتیمان بەوە هەیە کارەکان بەدروستی ئەنجام بدەینو پیمان وایە کەبە کارکردنی بەردەوام دەتوانین بەم ئامانجە بگەین.

" هەولدان، کەوتن، هەستانەوەو دوبارە هەول دانەوە گرنگە، بەلام با ریگە بەخواوەند بدەین یارمەتیمان بدات. با لەنیو هەولیکی گەورەدا سەیری خۆمان بکەینو ریگە بەو بدەین خۆی ئاشکرا بکاتو ئیمە رینوینی بکات.

" وەرن باریگەی بدەین ماوەیەك لەئامیزمان بگریت"

کوره لاویك دەیویست ریگەی مەعنەوی ببریت، بەدوای رۆحانییەکدا رۆشت کە لەپەرستگەی سیتا بوو.

باوکە گوتی: " بۆ ماوەی یەك سال، هەرکەسی خراپ لەگەڵتدا جولایەوە پارەی بدەری."

دوازدە مانگی تەواو، لاوە هەر کاتی سوکایەتی پیدەکرا، پارەی دەدا. لەکۆتایی سالدا، لاوە بۆ فیربوونی وانەی دواتر هاتە لای باوکە.

باوکە گوتی: " بچۆ بۆ شارو هەندیك گۆشتم بۆ بکرە."

هەرئەوەندەی لاوە ئەویی جیهیشت، باوکە خۆی بەشیوەی سوالکەریك لی کردو لەو لارییەوە کەشارەزای بوو خۆی گەیاندە دەروازەی شار. کاتی لاوەکە گەیشت، باوکە دەستی کرد بەسوکایەتی پیکردنی.

لاوە بەسوالکەرە درۆینەکەی گوت: " زۆرچاکە! سالیکی تەواو ناچار بووم لەبەرامبەر سوکایەتی پیکردنمدا بری پارە بدەم بەو کەسەی سوکایەتیم پیدەکا. بەلام ئیستا دەتوانم بەخۆراییو بەبی خەرج کردنی تەنانەت یەك پاپاسیش، سوکایەتیم پیبکری."

باوکە بەبیستنی ئەم رستەیە، جلە سوالکەرییەکانی لەبەریا داکەندو گوتی: " تۆ بۆ هەنگاوی دواتر ئامادەیت، لەبەرئەوەی فیربوویت بەروی کیشەو گرفتەکانتەوە پیبکەنیت.

نوسەرو دووان لەهاوریکانی لەشەقامەکانی نیویۆرك دا پیاسەیان دەکرد. لەپر لەنیو قسەوباسیکی بی بایەخ دا، دوانەکە دەستیان کرد بە دەمەقالەو سوکایەتی کردن بەیەکتر. ماوەیەك دواتر کەمەسەلەکە هیور بووەوە، لەچیشتخانەیەکدا لەدەوری یەك دانیشت بوون، یەکی لەو دوانە داوای لیبوردنی لەویتریان کردو گوتی: "هەستم کرد ئازار گەیاندن بەدۆستو ئاشنایان زۆر سادەیە. ئەگەر تۆغەریبە بویتایە. من زۆر زیاتر خۆم کۆنترۆل دەکرد. بەلام چوون تۆ دۆستی من بوویتو منت لەهەر کەسیکیتر باشتر دەناسی تورەو تۆسنانە رەفتارم کرد."

رەنگە ئەمە سروشتی مرۆڤ بیت، بەلام دەبیت لەدژی خەبات بکەین.

ساتگەلیك هەن زۆر حەز دەكەین یارمەتی كەسی بدەین، بەلام هیچمان لەدەست نایەت. یان ئەوەی هەلومەرجەكە بەجۆریكە ریگە بەپیشنیاری یارمەتی نادات یان كەسەكە لەپەیوەند بەهاوپشتیو پشتیوانی كردنەوە هیچ قسەیەك قبول ناكات.

پیر دەلیت:

" ئەوین هەمیشە هەیە. تەنانەت ئەو كاتەیشی كەزۆر هەست بەبیهودەیی دەكەین، دەتوانین خۆشەویستی بكەین - بەبی چاوەروانی پاداشتو سوپاسو كردەوەی بەرامبەر.

" ئەگەر بتوانین بەو شیوەیە رەفتاربكەین، لیهاتوویی و توانای ئەوین دەست دەكاتە گۆرینی جیهانی چواردەوری ئیمە. كە ئەم لیهاتووییە دەردەكەویت، هەمیشە دەتوانی كارەكەی بەئەنجام بگەیەنیت."

پازده سال لەمەوپیش، لەقۆناغی ئەوپەری رەتکردنەوەی باوەردا، نوسەرو هاوسەرەکەی و یەکی لەدۆستەکانیان لەریۆدوژانیرۆ بوون. کاتی بەیەکەوە دەیانخواردەوە، یەکی لەهاوری زۆر کۆنەکانی نوسەر کەلەدەیەی٦٠ و٧٠ دا پیکەوە دەستیان دابووە سەرشیتییەکی زۆر، هاتەبارەکەوە.

نوسەر لیی پرسی: " کاروبارت چۆنە؟ چی دەکەیت؟"

هاوریکەی گوتی: " بوومەتە قەشە."

کاتی لەوی هاتنە دەری، نوسەر ئاماژەی بۆمندالیك کرد لەکەناری شۆستەکەدا نوستبوو و گوتی: " دەبینی عیسا چەند گرنگی بەبارودۆخی دنیا دەدات؟"

قەشە گوتی: " هەلبەتە دەیبینم، ئەو؛ ئەم مندالەی ریك لەبەردەمی تۆدا دانا، تادلنیا بیت تۆ دەیبینیو کاریك دەکەیت."

## ١٥٦

دەستەیەك لەزانایانی جولەكە لەدەوری یەك كۆبوونەوە هەتا كورتترین دەستوری رەوشتیی بۆ دنیا داریژن. ریسای كۆبوونەوەكە وابوو هەر كەسێ بتوانێ لەو ماوەیەدا كەلەسەر یەك پێ راوەستاوە، ئەو یاسایانە پیناسە بكات كەدەبیت بەسەر رەفتاری مرۆڤەوە فەرمانرەوا بیت، بەداناترینیان دەناسریت.

یەكێ لەوان گوتی: "خواوەند تاوانباران سزا بدات."

ئەوانیتر باسیان كرد كەئەمە یاسا نییە، بەلكو هەرەشەیە. سەرئەنجام رستەكەی ئەو قبوڵ نەكرا. لەم ساتەدا حاخام هیلل[1] هاتە كۆرەكەوەو لەحالیكدا كەلەسەر یەك پێ وەستا بوو گوتی: "لەگەڵ كەسدا وارەفتار مەكە كەلات پەسەند نییە ئەو وا رەفتار لەگەڵ تۆ بكات. ئەمە یاسایە، ئەوانی دی لیكدانەوەی شەرعیین."

حاخام هیلل بەهۆشمەندترین كەسی ئەو كۆرە هەلبژیردرا.

[1]. Rabbi Hillel

(جــۆرج بیرناردشــۆ)[١]ی نوســەری ئینگلــیزی، ڕۆژیــك لــەماڵی هاوڕییـــەكی پەیكەرتاشی(ج. ئیپشتاین)[٢] پارچە بەردیكی گەورەی دی. لەوی پرسی: "دەتـەویت چی لەم بەردە بكەیت؟"

ئیپشتاین وەڵامی دایەوە: "هیشتا نازانم. خەریكم بیری لی دەكەمەوە."

شۆ سەرسامانە گوتی: "یانی تۆ نەخشە بۆ ئیلهامـەكانت دەكیشی؟ پیت وانییـە هونەرمەند دەبیت ئازاد بیت تاهەر كاتێ كە ویستی ڕای بگۆڕیت؟"

ئیپشتاین گوتـی: "بۆچوونەكەی تـۆ كاتـێ بەكـەڵك دێ كەهـەموو ئـەو كـارەی هونەرمەند، پاشی ڕاگۆڕین دەبیـت ئـەنجامی بـدات، لـول كـردنو پلیشانەوەی پـەرە كاغەزیكی پینج گرامی بیت: بـەڵام كاتـێ لەگـەڵ چوار تـەن بـەردا ڕووبـەڕوویت، دەبیت جۆریكی دی بیر بكەیتەوە.

پیر دەڵیت:

"هەر یەك لەئیمە باشترین ڕیگە بۆ ئەنجامدانی كارەكـەی خـۆی دەزانـێ. تـەنیا ئەو كەسەی لەگەڵ كاردا بەرەوڕوو دەبیت، دەزانیت چ مەسائیلی لەپیشە."

---

[١]. George Bernard Show
[٢]. J. Epstein

١٥٤

کاکە جۆن بیری دەکردەوە: "من دەبیت وەکو فریشتەکانم لێ بیت. ئەوان جگە لەقوڵ بوونەوە لەشکۆداری خواوەند هیچ کاریکی دی ناکەن." هەر ئەو شەوە پەرستگەی سیتای بەرەو بیابان بەجێ هیشت.

هەفتەیەك تیپەریی و دووبارە گەرایەوە بۆ پەرستگە. برای دەرگاوان گویی لەدەنگی تەقولبابی ئەو بوو، پرسی: کێیە؟

کاکە جۆن وەڵامی دایەوە: "منم، کاکە جۆنم. برسیمە."

کاکی دەرگاوان گوتی: "ئەستەمە. کاکە جۆن لەبیابانەو لەحالی ئەوەدایە خۆی بکات بەفریشتە. ئەو چیدی هەستی برسیتی نییەو ناچار نییە بۆ ژیانی خۆی کاربکات."

کاکە جۆن گوتی: "لەغرورم ببورە. فریشتەکان هاوەلی مرۆڤن. ئەمە ئیشی ئەوانەو هەر لەبەر ئەوەشە بیر لەشکۆداری خواوەند دەکەنەوە. منیش دەتوانم لەکاتی کاری رۆژانەمدا بیر لەو شکۆو گەورەییە بکەمەوە."

بەوتنی ئەو قسە بێ فیزانە، کاکی دەرگاوان دەرگای بەروی جۆندا کردەوە.

لەنیو هەموو ئەو ئامیرە ویرانکەرانەی کەمرۆڤ دایهیناون، ترسناکترینو -ترسۆنۆکترین - چەکیان، وشەیە.

بۆکسو چەکە گەرمەکان، سەرئەنجام هەندیك خوین بەجیدەهیلن. بۆمباکان، ماڵو شەقامەکان ویران دەکەن. ژەهرەکانیش دەتوانریت بناسرینەوە.

پیر دەلیت:

"وشە دەتوانیت بەبێ بەجێ هیشتنی هیچ سەرە هەودایەك ویران بکات. باوکانو دایکان سالهای ساڵ منالەکانیان شەرتی دەکەن. پیاوان بەشیوەیەکی خوانەناسانە سەرزەنشت دەکرین. ژنان بەتەرزیکی بەرنامەریژ کراو بەقسەی میردەکانیان سەرکوت دەکرین. کەسانیکیش کەخۆیان بەشیکەرەوەی قسەی خودا دەزانن، باوەرداران لەئایین دوور دەخەنەوە.

"سەیربکە بزانە تۆیش ئەم چەکە بەکاردینیت؟ یان کەس ئەم چەکەی لەبەرامبەر تۆدا بەدەستەوە گرتووە؟

"بەر بە بەردەوام بوونی هەردوکیان بگرە."

١٥٦

چیرۆکیکی کۆن لەبیابان، باسی پیاویك دەكات كەدەیویست میرگەكەی خۆی جیبهیلیتو روبكاتە میرگیکیتر. کابرا دەستی کردە بارکردنی وشترەکەی. سەرەتا قالیچەکانی لەسەر پشتی ئاژەلەکە دانا، پاشان قاپ و قاچاغ و بۆفی جلەکانی، ئاژەلەکە بەهیورییەوە هەمووی قبولْ کرد. ئالەو کاتەدا كەدەیانویست بجولین، کابرا ئەو پەرە شینە جوانەی کەوتەوە بیر کەباوکی پیی دابوو. پەرەکەی دۆزییەوەو خستیە سەر پشتی وشترەكە. بەم کارە، ئاژەلەکە هاتە سەرچۆكو گیانی سپارد.

کابرا لەدلی خۆیدا گوتی: "وشترەکەی من تەنانەت توانای کیشی یەك پەریشی نەبوو."

جاروبار بەم چەشنە لەبارەی خەلکانی دییەوە بیر دەکەینەوەو بەبێ ئەوەی بیر بکەینەوە کەلەوانەیە گالتە بچوکەکەی ئیمە دلۆپیك بیت جامی غەمەکانی ئەو پر بکات.

کەسێك بەنوسەری گوت: "هەندێ کات خەلکی واخوو بەو شتانەوە دەگرن کەلەفیلمەکاندا دەیانبینن؛ چیرۆکە راستییەکە لەبیر دەبەنەوە. فلیمی دە فرمانت بیرماوە؟"

نوسەر وەلامی دایەوە: "هەلبەتە. موسا- چارلتون هستون[١] - گۆچانەکەی بەرز دەکاتەوەو ئاوەکان دولەت دەبن‌و بەنی ئیسرائیل دەتوانن لەدەریای سوور بپەرنەوە."

کەسەکە گوتی: "بەلام لەئینجیل دا بەم شیوەیە نییە. خواوەند فەرمان بەموسا دەکات: (بەبەنی ئیسرائیل "یەعقوب" بلێ هەنگاو هەلینن.)و تەنیا ئەو کاتەی کەئەوان بەری کەوتن، موسا گۆچانەکەی بەرز کردەوەو ئاوەکان لیك جیابوونەوە. لەبەر ئەوەی تەنیاجورئەتی هەنگاونانە کەدەبیتە هۆی ئەوەی ریگەی خۆیان بدۆزنەوە.

---

١. Charlton Heston

## ١٥٨

ئەم نوسینە، پابلۆ کاسالزی[1] ڤیلۆنژەنی سۆڵ نوسیویەتی:

"من هەمیشە لەحالی ئـەفراندنی نویـدام. هـەموو بەیانییـەك کـاتی سـەرلەنوێ دەست پیکردنەوەی ژیانە. هەشـتا سـاڵ لەمـەوپیش، رۆژی خۆمـم وادەسـت پیکـرد. بـەڵام ئەمـە بەومانایـە نـیـە کەئـەم شـیوازو رەوتـە میکـانیکی بیـت. ئـەم کـارە بـۆ شادمانی من پیویستە.

"لەخـەو هەلدەسـتم. دەچمـە لای پیانۆکـەو دوو پارچـە لەمەقتوعـەکانی بـاخ دەژەنم. ئەم پارچانە وەك بلیی مالەکەم پیرۆزو تەبەروك دەکـەن. بـەڵام ئـەم کـارە لەهـەمان کـاتدا ریگایەکـە بـۆ بەرقـەراری پەیوەندییـەکی تـازە لەگــەڵ رازی ژیــانو موعجیزەی مرۆڤبووندا.

"ئەگەر چی من هەشتا ساڵ ئەم شیوازو رەوتەم دووبارە کردۆتەوە، بـەڵام هیـچ کاتێ مۆسیقاکە دووبارە نەبوو- بەردەوام شتیکی نوێ و خەونیکی باوەر پینەکراوی فیر دەکردم."

---

[1]. Pablo Casals

## ١٥٩

**پیر دەلیت:**

**لەلایەکەوە دەزانین گرنگە بەدوای خودادا بگەریین. لەلایەکیترەوە، ژیان لەنیوان ئیمەو ئەودا رادەوستیَ. هەست دەکەین لەلای خواوەندیتیەوە پشت گوی خراوین، یان ئەوەی کارە رۆژانەییەکان ئیمەیان بەخۆیانەوە سەرقالٚ دەکەن. ئەمە، هەستی گوناه لەئیمەدا پیکدەهینی: یان لەپیناوی خودادا لەرادەبەدەر نکۆلی لەژیان دەکەین، یان ئەوەی هەست دەکەین لەبەر ژیان خوامان لەبیرچۆتەوە.**

**"ئەم لیکدژییە ئاشکرایە، لەخەونو خەیالیَ زیاتر نییە: خودا لەژیاندایەو ژیانیش لەخودادایە. هیندە بەسە کەسیَ لەم مەسەلەیە ئاگادار بیت تاباشتر بتوانیت پەی بەچارەنوس بەریت.**

**"ئەگەر بتوانین نفوز بکەینە نیو هاوئاهەنگی پیرۆزیی ژیانی رۆژانەوە، ئەوا هەمیشە لەسەر ریگەی راست دەبینو دەتوانین کاری خۆمان بەئەنجام بگەیەنین."**

ئەم رستەیە هی پابلۆ پیکاسۆیە[١]:

"خواوەنـد هونەرمـەندە. ئـەو زەرافـەو فیـلو میرولـەی داهینـاوە، راسـتییەکەی ئەو هەرگیز بەدوای یەك شیوەوە نەبووە - ئەو هەرچی دەویست کردی."

پیر دەلیت:

"کاتـێ ریگەکـەمان دەسـت پـێ دەکـەین،ترسـیکی گـەورە دامـاندەگرێ. هەسـت دەکـەین لەسـەرمانە هـەموو کـاریك بـەریکی ئـەنجام بدەیـن، چونکـە تـەنیا یـەك تەمـەنمان بـۆ ژیـان هەیـە. ئـەوەی کەسـتانداردی (هـەموو کـاریك دەبیـت دروسـتو تەواو بیت)ی دانا، کێ بوو؟ خواوەند، زەرافەو فیلو میرولـەی خـەلق کـرد – ئیمـە بۆ دەبیت بەدوای ستاندارادا بگەرییـن؟"

ستاندارد تـەنیا بەکـەلکی ئـەوە دیـت کـەپیمان بلیـت کەسـانی دی راسـتییەکانی خۆیان چۆن چۆنی پیناسە دەکەن. زۆربەی جار کـاری کەسـانیترمان بەدلـە. بـەلام زۆر جـاریش دەتوانـین لـەو هەلانـەی کەکەسـانی دی کردوویانـە خۆمـان بـەدوور بگرین.

"بـەلام لـەپیناوی بـاش ژیـان بەسـەر بردنـدا، ئیمـە تـەنیا خۆمـان دەزانـین چ شیوەیەك بۆ خۆمان هەلببژیرین."

[١]. Pablo Picasso

## ١٦١

چەند پارسایەکی جولەکە لەکەنیسەیەکدا سەرقالی خواپەرستی بوون، گوییان لەدەنگی منداليك بوو دەیگوت: "ئەلف، ب، پ..." هەولیاندا بیرکردنەوەی خۆیان لەسەر تەورات چربکەنەوە، بەڵام دەنگەکە بەردەوام دووبارە دەبووەوە: "ئەلف، ب، پ...." مەراسیمەکەیان راوەستاندو سەیری ئەملاوئەولایان کرد. منداليك بەهەمان ئاوازەوە پیتەکانی دوبارە دەکردەوە.

حاخام بەکورەی گوت: "بۆچی وا دەکەیت؟"

کوریژگە گوتی: "من ئایەتە پیرۆزەکان نازانم، لەبەرئەوە ئومیدەوار بووم کەئەگەر پیتەکان بەدەنگی بەرز بخوینمەوە، ئەوا خودا بۆ دروست کردنی وشەی راست سوود لەو پیتانە وەربگریت."

حاخام گوتی: "لەو وانەیەی کەفیرت کردم سوپاسگوزارمو دەبیت منیش، وەکچۆن تۆ پیتەکانت بەخودا سپارد، ئاوا رۆژانی ژیانم لەم دنیایەدا بەخودا بسپیرم."

پیر دەلیت:

"دەتوانریت گیانی خواوەند کە لەبوونی هەمووماندا ئامادەیە، بەپەردەی سینەما بچوینریت. لەسەر پەردەکە، روداوو پیشهاتی جۆراوجۆر رودەدات- خەلکیك ئاشق دەبن، خەلکی لەیەك جیادەبنەوە، گەنجو خەزنەگەلیکی زۆر دەدۆزرینەوەو ولاتو سەرزەمینیکی دووریش ئاشکرا دەکرین.

"هەر فیلمیٚ نمایش بکریت، پەردەکە هەمان پەردەیە. ئەگەر فرمیسكو ئەشك دەریژریو خوین دەرژینریٚ گرنگ نین، لەبەرئەوەی هیچ کامیکیان ناتوانن سپیتی پەردەکە لەکەدار بکەن.

"هەروەکو پەردەی سینەما، خواوەند لەپشت هەموو رەنجو شادمانییەکی مرۆڤەکانەوە هەیە. کاتیٚ فیلمەکە تەواو دەبیت، دەتوانین بیبینین."

١٦٣

تیر هاویژیك كەبـە راهینانـە دژوارەكان بـەناوبانگ بـوو، بەدارسـتانیكی نزیكی پەرستگەیەكی هندۆسـیدا تیدەپـەری. لەدارسـتانەكەدا، راهیبـەكانی بینـی سـەرقالی خواردنەوەو سەماكردن بوون.

بەدەنگی بەرز گوتـی: "ئەوانـەی بەریگـەی خـوادا دەرۆن چـەند بیركردنـەوەیان هەلەیە. باسی دیسپلین دەكەن، كەچی كە بەتەنهاش دەبن خۆیان مەست دەكەن."

پیرترین راهیب پرسی: "ئەگەر بەتیرو كەوانەكەت سەد دانـە تـیر یـەك بـەدوای یەكدا بهاویت، كەوانەكەت چی بەسەر دیت؟"

كەوان بەدەست گوتی: "كەوانەكەم دەشكیت."

راهیب گوتی: "ئەگەر كەسێ بگاتـە لوتكـەی تواناییـەكانی، ئـیرادەی تیكدەشـكێ. كەسێ كەناتوانیت لەنیوان كارو پشودانیدا هاوسەنگییەك دامـەزرینی، حـەزو تاسـە لەدەست دەدات و بێگومان زۆر دوور ناروات."

پاشایەك بالویزیکی بۆ وڵاتیکی دوور ناردو ئیمزاکردنی پەیماننامەیەکی ئاشـتی پـێ سـپارد کـەدەبوو ببەسـترایە. بـالویز کەدەیویسـت لەگەشـتەکەی سـوودیکیش وەربگرێ، هاوریکانی خۆی، کەئیش‌وکارگەلی بازرگانی گرنگیان لـەو وڵاتـەدا هـەبوو، ئاگادار کردەوە. ئەوان داوایان لیکرد گەشتەکەی دوابخات، جا لەبەرئەوەی بریار بوو پـــەیمانی ئاشـــتی ببەســـتریت، راســـپاردەگەلیکی نوییـــان نوســـیو سیاســـەتە بازرگانی‌یەکانی خۆیان گۆری.

کاتـێ بـالویز بـۆ گەشـتەکەی بەریکـەوت، کـات بـۆ تەسـلیم کردنـی پەیماننامـەی ئاشـتی زۆر درەنـگ بووبـوو. جـەنگ هەلگیرسـاو نەخشـەکانی شـاو ئـەو پەیوەندیـە بازرگانیانەی کەئەو پیاوانەی گەشتەکەی بالویزیان وەدوا خستبوو، لەناو چوو.

پیر دەلیت:

"تەنیا یەك شتی گرنگ لەژیانی ئیمەدا هەیە: ژیان لەسەر بنچینەی ئەفسـانەی شەخسی - ئەو کـارەی بـۆ بەجیـهینانی دیـاریکراوین. بـەلام ئیمـە ئـەوەندە خۆمـان بەحەزو ئارەزوی بێ سوودەوە سەرقال دەکەین کە خەونەکانمان لەناو دەبەین."

نوسەر لەبەندەری سیدنی بوو و تەماشای ئەو پەردەی دەکرد کەهەر دوو لای شاری بەیەکەوە دەبەستەوە. کەسیکی ئوسترالی لیی نزیك بووەوەو داوای لیکرد ئاگادارییەکی نیو رۆژنامەیەکی بۆ بخوینیتەوە. ئەو گوتی: "پیتەکان زۆر وردنو منیش چاویلکەکەم لەمالەوە جیهیشتووە. ناتوانم پیتەکان لیکجیابکەمەوە."

نوسەریش چاویلکەی خویندنەوەکەی پیّ نەبووو داوای لیبوردنی لیکرد.

ئوسترالییەکە گوتی: "زۆرباشە، وای بۆ دەچم ئاگاداریەکە فەرامۆش بکەم."و لەحالیکدا تامەزرۆ بوو دریژە بەوتوویژەکە بدات گوتی: "هەر ئیمە نین کەباش نابینین. خوداش بەرچاوی تاریکە. نەك لەبەرئەوەی پیر بووە، بەلکو لەبەرئەوەی خۆی وایدەویت. لەم حالەتەدا، کاتیّ کەسیّ لەنزیکی ئەوەوە گوناهیك دەکات، ناتوانیت بەرۆشنی بیبینیت، بەبیّ ئەوەی کەبیّ ویژدانی کردبیت، دیتو لیی خۆش دەبیت.

پرسیم: "ئەی سەبارەت بەکارە باشەکان چی؟

لەحالیکدا کەکابرا پیدەکەنیو دوور دەکەوتەوە، گوتی: "باشە، هەلبەتە ئەو هیچ کاتیّ چاویلکەکەی لەمالەوە بەجیّ ناهیلیت."

١٦٦

موریدێ لەپیرەکەی پرسی: "ئایا شتیك هەیە لەخواپەرستی گرنگتر بیت؟"

پیر بەقوتابییەکەی گوت، لەو بنچکەدارەی کەلەو ناوە بوو لقیك لیبکاتەوە.

مورید بەقسەی کرد.

پیر پرسی: "ئایا بنچکەکە هیشتا زیندوە؟"

مورید وەڵامی دایەوە: "بەهەمان ئەندازەی جاران زیندووە."

پیر گوتی: "ئیستا برۆ رەگەکانی بقرتینە."

مورید گوتی: "ئەگەر وابکەم، بنچکەکە وشك دەبیت."

پیر گوتی: "خواپەرستی لقی درەختیکە کەباوەر رەگەکەیەتی. رەنگە باوەری بێ خواپەرستی هەبیت، بەڵام خواپەرستی بێ باوەر مەحالە هەبیت."

١٦٧

سـەنتتریزا داڤیـلا[1] دەلیـت: "بـیرت بـێ، خواوەنـد هـەمووماني بـانگكردووە، لەبەرئەوەی ئەو حەقیقەتی رەهایە، نـاتوانین گومـان لەبانگەوازەکـەی بکـەین. ئـەو گوتویە: "هەموو ئەوانەی تینوویانە با بەرەو لای من بین، من تیرئاویان دەکەم."

"گەر بانگـەوازی ئـەو بـۆ هـەمووماني و یـەك بەیـەكی ئیمـە نەبووایـە، دەیگوت: (هـەر کامیکتـان دەتانـەویت، بـەرەو لای مـن وەرن، لەبەرئـەوەی هیچتـان نییـە لەدەستی بدەن. بەڵام من تەنها ئەوانە تیر ئاو دەکەم کەشایستەن."

"ئەو هیچ مەرجیك دانانیت. هیندە بەسە هەنگاو بنییتو بتـەویت، لەئـەوینی ئەو ئاوی ژیان دەنۆشی."

---

[1]. Saint Teresa d' Avila

کاتێ راهیبانی زن دەیانەویت سەرقالی مەشقی چاوەدیری بن، لەبەردەم تاویرە بەردیکدا دادەنیشن‌و دەلین: "ئیستا من ئارام دەگرم تائەم بەردە بریک گەورەتر ببیت."

پیر دەلیت:

"هەموو شتێ لەچوار دەوری ئیمەدا لەگۆرانی بەردەوامدایە. هەموو رۆژێ، خۆر روناکی بەسەر جیهانیکی نویدا پەخش دەکاتەوە. ئەوشتەی ئیمە بەدوبارەو سواوو بێ گۆرانکاری دەزانین، پرە لەپیلان‌و پیگەی نوێ. بەلام ئیمە پەی بەوە نابەین کەهەموو رۆژەکان لەگەل یەکتردا جیاوازن.

"ئەمرۆ، لەشوینیک، خەزنەیەك چاوەروانی تۆیە. رەنگە زەردەخەنەیەکی تیژ تیپەر بیت یان سەرکەوتنیکی گەورە بێ. فەرق ناکات.

"ژیان پرە لەموعجیزەی بچوك‌و گەورە. هیچ شتێ ماندوو کەر نییە. لەبەرئەوەی هەموو شتێ لەگۆرانی بەردەوامدایە. یەك جۆریی هی ئەم دنیایە نیە.

"تی. سی. ئەلیەتی شاعیر دەلیت: "بەریگەو بانی هەمەچەشن دا برۆو بۆ مالەکەت بگەریرەوە، وا تەماشای هەموو شتێ بکە وەك بلیی یەکەمین جارە دەیبینیت.)"